**ناسنامەی کتێب:**

**ناوی کتێب**: **دیوانی ئەحمەدبەگی کۆماسی**
**کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە**: **موحەممەدعەلی سوڵتانی**
**وەرگێڕان و هێنانەوەی شیعرەکان بۆ سەر ڕێنووسی کوردی**: **کولسووم عوسمانپوور**
**ڕووبەرگ**: **ئەفشین بەهاریزەڕ**
**پیتچنین**: **سنە، ڤیان کامپیوتر ۰۸۷۱ ۲۲۶ ۷۴۸۰**
**ڕازاندنەوەی**: **ئاری عەبدی** (ary_abdi@yahoo.com)
**ساڵی لە چاپدان**: **۱۳۹۰**
**ئەژمار**: **۲۰۰۰ بەرگ**

# پێرست

به ناوی خوای دەهەندە و دلۆڤان

## پێشەکی

بۆ یەکەم جار کە لەگەڵ شێعرەکانی ئەحمەد بەگی کۆماسی ئاشنا بـووم ساڵی ١٩٩٠ بوو کە وەکوو نووسەر و وێژەری بەرنامەکانی ڕادیۆ سنە ئـاوارەی دۆزینەوەی ژیاننامە و شێعری شاعێرەکانمان بووم.

کاتێک شێعرە بە سۆزەکەی «گلـکۆی تـازەی لـەیل»ی ئەحمەدبـەگی کۆماسی یـەکێک لـە بەرنامـە ئەدەبیـەکانی ئـەو کاتـەی ڕادیـۆی ڕازانـدەوە ژمارەیەک زۆر لە گوێگرەکان، بە نامە و تەلەفوون داواکاری شـێعری زۆرتـر و ژیاننامەی ئەم شاعێرە ناسکخەیاڵەمان بوون. بەڵام بە داخەوە جگە لە کتێبە بەنرخەکەی «تاریخ مشاهیر کُرد» لە خوالێخۆشبوو «بابامەردۆخی ڕۆحانی» و «مێژووی ئـەدەبی کـوردی» لـە «عەلائـەددین سـەججادی» سـەرچاوەیەکم دەست نەکەوت.

ئەگـەرچی کـە سـەردەمی ئـەم شـاعێرەمان زۆر دوور نیـە بـەڵام ژیاننامەیـەکی ڕوون نەکەوتووەتـە بەردەسـت تـا ئـەم سـاڵانە کـە دیـوانێکی باریکەلانەم بینی کە شێعری زۆرتری ئەحمەدبەگی تێدا کۆ برابـووەوە، بـەڵام جگە لە چەند شێعری مامۆستا مەولەوی تاوەگۆزی کە بۆ ئەحمەدبەگی وتبوو

و لــە دیوانەکــەی مەولەویــدا وەرگیرابــوو، شــێعرەکانی دیکــەی دیوانەکــەی ئەحمەدبەگ هەمووی بە ڕێنووسی فارسی بوو. فەرهەنگۆکێکی چکۆلانەش لە ئاخری شێعرەکانەوە بۆ خوێنەری فارس دانرابوو. من کە خۆم ئاشنای ئەدەبی گۆران و زمانی هەورامی بووم، بە هۆی ئاڵۆزی ڕێنووسەکەوە چێژێکی ئاوەهام لە شێعرەکان نەدەبرد؛ حــەیفم لێهــات کــە دیــوانی ئەحمەدبــەگمان بێــت و خوێنەری کورد کەڵکی لێ وەرنەگرێ. هەر بەم بۆنــەوە لەســەر ئیزنــی بــەڕێز موحەممەدعــەلی سوڵــتانی شــێعرەکانم هێنایــە ســەر ڕێنووســی کــوردی و پێشەکی و فەرهەنگۆکەکەم وەرگێڕایەوە. هیوادارم گوڵزاری ئــەدەبی کــوردی لەمە ڕازاوەتر بێت.

سنە/ بەهاری ١٣٩٠

کولسووم عوسمانپوور

## دەسپێک

بەڵگەی زیندووی ڕابردووی نەتەوە و گەلانی کۆنی دنیا، ئەدەب و فەرهەنگی دەوڵەمەندو شاکاری ڕۆخسارە دیارەکانیانە، کە لە فیکری زیندوو و لێهاتوویان سەرچاوە دەگرێت و لە سەر باڵی زەین، سنوورەکان دەبەزێنێ و سیمای باڵانوێنی وێژەی کومەڵگا و نیشتمانی خۆیان لە بەستێنی شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی وردبینانەی لێکۆڵەرانی دوورئەندیشەوە بە جیهانیان پیشان ئەدات.

– «گڵکۆی تازەی لەیل»ی ئەحمەد بەگی کۆماسی بەرهەمی شاعیری ناوداری کوردی سەردەمی قاجار، لەو جۆرە ئەدەبەیە کە وا نزیک بە سەدەیەکە سەرنجی لێکۆڵەران و ڕۆژهەڵاتناسانی ئۆرووپا و ئاسیای بۆ خۆی ڕاکێشاوە و لە هەر جێگایەک باسی ئەدەبی کوردی دێتە ئاراوە، بە هێنانەوە و دەنگ دانەوەی ئەم بەڵگە، ناو و یادی ئەحمەد بەگ خۆی ئەنوێنێ. ئەگەرچی

نامەوێ ڕەخنە بگرم لەو تێبینیانەی کە تا ئێستا بووە. هەر ئەوەی کە گەلانی دیکە بە زمانی ئێمە خۆیانیان خەریک کردووە و بە باشترین شێوە ئەرکەکەیان بەڕێوە بردووە، سپاسیان دەکەین.

دەسپێکی قسەکانم بە وەرگێڕانی قسەکانی ئەوان دەخەملێنم، مینۆرسکی نووسیویە: *«لە ساڵی ١٩١٧ هاوڕێم دوکتۆر سەعید خانی کوردستانی دەقی شینگێڕیەکی پێدام کە وا نووسراوەی ئەحمەد بەگی کۆماسی بوو. ئەم دەقە گرێ لە کارم کردەوە. ئێمە ئەبێ فەرز لە سەر ئەوە دانێین کە ئەحمەد بەگی کۆماسی جەختی لە سەر ئەوە کردووە کە شێعرەکانی بە زمانی* koiuy *بخوێنرێتەوە.*

*بەم بۆنەوە ئەو شێوە کە دوکتۆر سەعیدخان شێعرەکانی دەخوێند و شی دەکردەوە، زۆر بە سەختی ئەتوانین وەکوو ڕاستی بیسەلمێنین. لەوانەیە ڕۆژێک شێوەی نووسین و فونوتیکێکی ئاوەهامان دەسکەوێت.*

*ڕەنگە ڕۆژێک لە نێو کۆماسیەکاندا ئاوەها نیشانەیەکی فونۆتیکی ساز بێت تا ئێمە شیعرە شینگێڕیەکی ئەو «ئەحمەد بەگ» بە دەستکەوتێکی ئەدەبیەوە لەبەر چاو دەگرین.*

*هەر بەم بۆنەوە وردبینی زاراوەی تاکەکەسی لە پلەی دووهەمدا دادەنێین. زانایەکی زۆرمان لە سەر نووسەر «ئەحمەد بەگ» نییە. جگە لەوەی کە لە هۆزی کۆماسییە. ناوچەی «کۆرەوەز» کەوا کۆماسییەکان دایانمەرزاندووە بیست گوندە و نفوسێک بەرانبەر بە ٢٥٠٠٠ کەس لە خۆ دەگرێت. ئەم ناوچەیە لە پارێزگای سنە (کوردستانە) و لە سەر جادەی سنە-مەریوان، لە لای چەپی ڕووباری هەورامانی تەختە.*

ئەم ناوچەیە «terra incohita»وە ئێمە ناتوانین بە دروستی بزانین کە ئاخاوتنی خەڵکی ئەم ناوچەیە لە سەر زاراوەی گۆرانیە یان نە. وای بۆ ئەڕۆین کە بە کارهێنانی زاراوەی گۆرانی لە لایەن ئەحمەد بەگ بەوە هۆی ئەوە بووە کە زۆربەی شاعیرانی ئەردەڵانی ئەم زاراوەیان بە کار هێناوە. [شێوەزاری هەورامی، شێوە زاری وێژەیی سەراسەری ناوچەی رۆژهەڵاتی ئێران لە باشووری ئازەربایجانەوە تا دەورووبەری شوشتەر و دێزفوول بووە. م.س]

ئەم شێعرە شینگێڕییە بە هەموو تازەیی و جوانییەوە دەقێکی شاعیرانەیە و بە ڕواڵەت وەکوو ئاسەوارەکانی ئەدەبی گۆرانە.

هەرکام لە دێڕە شیعریەکان لە دوو نیوە شیعری خۆش ئاهەنگ دروست بووە. و هەرکام لەو پدە بڕگە Crsura بە دوو بەشی پێنج بڕگەیی دابەش دەکرێن. ئەم غەزەڵە بە هۆی درێژی شیعرەکەوە زۆر بڕگەییە.

یەکەم مێسرەعی شێعرەکە ناتەواوە. یانێ تەنیا، داگری نیوەی دووهەمی میسراعەکەیە.

وەکوو ئەوەیە تەنیا ئاهەنگ و بابەتی شیعرەکە رابگەیەنێت؛ ئەم شێوە سەرمەشقی هەموو شیعرەکانە لە ئەدەبی گۆرانیدا لە شیعری پاڵەوانیەوە بگرە تا شیعری لیریکی و ئایینی باو بووە. رواڵەتی شێعرەکە زۆر ڕوون و ئاشکرایە.

ئەحمەد بەگ دەڕواتە سەر مەزاری هاوسەرەکەی تاکوو گۆڕەکەی نۆژەن بکاتەوە (شیعر ۱-۳) بەم شێوە خەم و پەژارەی خۆی رادەگەینێ (شیعر ۱۹-٤) سۆزی ئازار و پەژارەی زۆرتر دەبێت ئەوکاتەی کە دەبینێ خۆشەویستەکەی لە نێو تاریکی و سەرمادا خەوتووە (شیعر ۲٤-۲۰) شاعیر، زوڵفی نازدار و چاوی خوماری وەک غەزاڵی یاری وەبیر دێنێتەوە؛ یار بۆ لێی

دابڕاوە؟ (شیعر ٣٢-٢٥) بێدەنگی. بۆ وڵامی ناداتەوە؟ لەوانەیە کـە عەشـق و خۆشەویستی لە لای ئەو نەما بێ؟ (شیعرە ٣٩-٣٣) دەنگێک دەبیسـێ. گـۆڕ، ناهێڵێت یەخسیرەکەی وڵامێک بداتەوە. عاشق ناتوانێت چارەنووسـی خـۆی بگۆڕێت (شێعر ٤٩-٤٠) بە هیچ شـێوەیەک ناتوانێـت ڕزگـاری بێـت. عاشـق ئەبێ لە لای مەعشووقەکەی بێت. (شیعر، ٥٢- ٥٠) بەڵام، لەوانەیە، ئەحمـەد تا ئاخرین چرکەکانی ژیانی، خەمبار و داغداری، نازدارەکەی بوو بێت (شـیعر، ٥٣) چەند وێنەیەک لە وێنەکانی ئەم شینگێڕییە هی سـەردەمی ئیسـلامیە. ناوی هاوسەری کۆچ کردوو «لەیلا»یە هەر بەم بۆنەوە شاعیر، ناوی مەجنوونی بۆ خۆی هێناو، [بروانە، فەرهـەنگی وشـە، وشـەی لـەیلا] شـاعیر لـە ئـاگری جیاییدا وەکـوو قەقنـەس دەسـووتێت، مەعشـووقەکەی خـۆی بـە «سەوڵـی خەرامان» دەشوبهێنێ بەڵام جیا لەم نەوعە پیاهەڵدانە، بـە بیرێکـی ئـازاد لـە بواری وێژەی گۆڕاندا سەیری کردووە.

کاریگـەری مـەرگ، تەنانـەت نـەریتی شـیعری شـاعیرانی کلاسـیکی ئێرانیشی بێ هێز کردووە. ئەم بابەتە شیاوی ئاوڕدانەوەیـەکی تایبەتـە، بـەڵام هێنانـەوەی چەنـد نموونەیـەکی بـەناوبانگ لـە ئـەدەبی فارسـی، توانـایی و ڕەسەنایەتی شاعیری بەهەستی کۆماسیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. [فێردەوسـی] لـە شـێعرێکی شـینگێڕیدا لـە بـیرەوەری کـۆچی دوایـی کوڕەکەیـدا، ئـەو دەگەینێتە نووری ڕەها. لە دنیایی شیعرەکەیدا جێگایەک بۆ باوکەکـە دابـین کراوە.

فێردەوسی بە شیعری پاڵەوانی خۆیەوە، ستایشی ئەو خوایە دەکات کە گوناح و تاوانی لاوەکەی دەبەخشێت و جڵوبەرگی عەفو و لێبوردن لە بەریان

دەکات.

خاقانی کە کوڕی دایکێکی مەسیحی بووە، سێ شـێعری بـۆ هاوسـەری کۆچ کردووی داناوە. یەکێکیان شێعرێکی درێژە و سۆز و هەستی شاعیرانەی زۆر کەمە. بەڵام ئەو دوانەکەی دیکە سـادە و سـاکار و ناسـک و بەهەسـتەن. شێعرێکی بۆ ڕۆژانی تەنیایی خۆی و هاوسەری کۆچ کردووی داناوە و ئەڵێت،: ئەگەر بڕیار وایە ڕۆژەکانم تێکەڵ بە خەم و پەژارەی دووری تۆ بێـت، بـا ئـەم خەم و پەژارە بە قورس نەزانم. لە شێعرێکی دیکـەدا، ناڵـە و زاری دەکـات و هاوسەرەکەی بە وەفادار و تاقانە و باوڕپێکراو و ڕازداری فیکر ناو دەبات.

شینگێڕی «ئەمیر خوسرەوی دێهلەوی» بۆ دایکی، بـە هـۆی نـاوەرۆکی بابەتەکەوە زۆرتر بە دڵەوە دەنیشـێت. کەسـەر و پـەژارەی مـرۆڤ بـە هـۆی تەسلیم بوون بە چارەنووسەوە زووتر سارێژ دەبێ و ئەبێتـە هـۆی ئـەوەی کـە چارەنووس وەکوو شتێکی ئاشنا لەبەر چاو بگیردرێت.

چوارینەکەی حـافز کـە «بەهاریـە» نـاو نـراوە. هاوسـەنگییێکی تـەواو و بـێهاوتـای لـە نێـوان هەسـت و هۆنـەردا هەیـە. مامۆسـتای پـیری مـن [مینورسکی] اف، ای، گرش (١٩١٥-١٨٤٣.م) هەوڵی ئـەدا لەگـەڵ شـیعری یۆنانی بەراوردی بکات.

لە دوای ئەم نموونانە، بایەخدانان بۆ شیعری شینگێڕی سادە و سـاکاری زاگرۆس، ئاسانە. هەست و عاتیفەی شاعیرانە سادە و ساکار و بە قوەتە. هـیچ نەوعە راز و ڕەمزێکی تایبەتی، شێعرەکان بێ مانا ناکاتەوە.

وەکوو بێ بڕوایی مرۆڤ لەگەڵ پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگـەڵ سرۆشـتدا، ئەحمەد خان باسی ساردی گۆڕی لەیلا دەکات. بە زۆرەملـێ بـڕوا کـردن بـە

*ناباوڕیەکان کارێکی بێ هوودەیە؛ بەڵام خەمی دابڕان وەکوو ئەوەیە کە شاعیر لە شەڕێکی ڕاستەقینە زامدار بووبێت؛ لە ئاگری ئەو زامەدا ئەسووتێت و شیعرەکە بە تەسلیم تەواو نابێت. ئەم شێعرە لە کوردستاندا زۆر بەناوبانگە. «بندیکستن» ئەم شیعرەی لە هەورامان دۆزیوەتەوە. دواتر لە لایەن (کریستنسن) چاپ کراوە «زاراوەکانی هەورامانی پاوە»*

Det- kgl- danske
Vldon skabernes selskab his filol Medd- vi
*لاپەڕەی ١١٢-١٩٢١-٢ /*

*بەرگەیەک لەم شیعرە بە زمانی کوردی لە ئێستامبوول چاپ کرا [ئەنجوومەنی وێژەیی کورد، چاپ کراو لە لایەن کولونێل ئەمین فەیزی، سلیمانی، ئیستامبوول ١٣٩٩/١٩٢٠، لاپەڕەکانی ٩، ١٠٥ ...*

*بڵاو کەرەوەی ئەم دەسنووسە دەڵێ کە زمانی شیعرەکە کوردی ئێرانە، خوێندنەوەی زەحمەتە. بەڵام نووسەر توانابیەکیی زۆری لە پیشاندانی ژیاندا هەیە، دەقی تەواوی ئەم شیعرە لە تاراندا لیتوگرافی کراوە، بڕێ نیشانەی تایبەتی بۆ دانراوە تا خوێندنەوەی ئاسانتر بێت» «گۆران و یاران، مینورسکی».*

بەم تۆژینەوە و لێوردبینیە بەنرخە، و هەروەها بە پلە و پایەیەکی ئاوەها بەرز لە فەرهەنگ و ئەدەبی کوردیدا، حەیفم لێ هات کە ئەحمەد بەگ خاوەنی دەفتەر و دیوان نەبێت. سەرەڕای ئەو هەموو تەنگ و چەڵەمەی رۆژگارە، هەنگاوم هەڵگرت. ئەوەی کە لە دەستنووسەکان و سەرچاوەکاندا هەبووە. دوای بەراوەرد کردن و هەڵسەنگاندنی پێویست، هەڵمبژارد. ئەم دەستکەوتە، ئاکامی هەڵسەنگاندن و بەراوردکردنی دەیان بەیاز و دەفتەر و

دەستنووسە کەوا لە سەرچاوە ئەدەبیە سەرگەردانەکانی ناوچەی کرماشـان و کوردستاندا دەستم کەوتوون کە چاوەڕێی یەک بوون و پشکنین بۆ رۆژگـاری پێ گەیشتن بووە.

لێـرەدا بـە پێوەسـتی دەزانم لەگـەڵ دەقـی شـیعرەکە، ژیـاننامـەی شاعیریش بنووسمەوە. ئەگەرچی بە وتەی مینورسـکی: نیشـانەیەکمان لـەم شاعیرە لەبـەر دەسـتدا نیـە. هـەموو سـەرچاوەکان قەناعـەتیان کـردووە بـە نووسینی ناوی شاعیر. بەڵام هیـوادارم ئـەم دەفتـەرە سـەرەتایەک بێـت بـۆ ناسینی باشتری ئەم گەورە شاعیرە ناودارەی سەردەمی قاجارەکان.

## ئەحمەدبەگی کۆماسی و ئاسەوارەکانی

ئەحمەد بەگ، کوڕی خوالێخۆشبوو عەبدوڵلا بەگ، سەرۆکی عەشیرەتی کۆماسی لە ناوچەی «کرەوز» لە ناوەندی «سـنەدژ». سـەبارەت بـە مێـژووی ژیانی، هەر ئەوەندە ئەزانین کە هاوکـات و هاوزەمـەنی مەلاعەبدولـڕەحیمی تاوەگۆزی (١٣٠٠-١٢٢١ ک.م) بووە. بەڵام تەمەن و مێژووی لە دایکبـوونی و کۆچی دوایی بە چەند شێوەی جۆراوجۆر دەگێڕنەوە.

«عەلائەددینی سـەججادی» لـە بەشـی «بـاخی شـاعیران» ژمـارە ٥٤١ دەنووسێت: هاوکـات لـە ساڵـەکانی (١٨٧٦- ١٧٩٣)ی زایـینی بەرانبـەر بـە (١٢١٠-١٢٩٣ ک.م) ژیاوە.

«بەهائەددین ساحیب»، کە لەوانەیە هەر لەم سەرچاوەیە گـرتبێتی، لـە بەشـی «وێـژە» هـەر ئـەم مێژوویـەی دەستنیشـان کـردووە و شـوێنی لـە دایکبوونی گوندی «بەردە سپی» نووسیوە؛ بەڵام بەڕێز «سابیر بەگ»، کوڕی

خوالێخۆشبوو، «فەرەجوڵڵابەگی زنوری»، لە «فەرەجوڵڵا بەگی ونێن» کە لـە پیاوانی بە ساڵاچوو و لە نەتەوی «ئەحمەدبەگ» ئەگێڕێتەوە کـەوا لـە ئـاوایی «پیر خزران» لە دایک بووە و لە تەمەنی ٤٥ساڵیدا هەر لەوێ کـۆچی دوایـی کردووە. ناوی دایکی «خاتو پەریزاد» بووە.

لێرەدا بـە پێویسـتی دەزانم کـە ئـەم خاڵـە ڕوون بکەمـەوە کـە هـۆی دواکەوتنی ئەم لێکۆڵینەوە یـەکێکیان ئـەوەبوو کـە ماوەیـەکی زۆر هەوڵـمدا کەسێک لە بنەماڵە و نەتەوەی «ئەحمەدبەگی کۆماسی» بدۆزمـەوە. لـەدوای ماوەیەکی زۆر، بەرێز «شێخ موحەممەدی سێراجەددینی» ئەم باسەی سەرۆی بـۆ گێڕامـەوە، ئـەویش هەڵـەیە، بەڵگەیشـم، شـیعرەکانی دیوانەکـەی «ئەحمەدبەگە» چونکە مەولەوی لە تەمەنی حەفتاو نۆ ساڵیدا کـۆچی دوایـی کردووە. ئەحمەدبەگ چەند ساڵێک لە دوای مەولەوی ژیـاوە، بـۆ وێنـە لـەم کتێبـەدا لـە لاپـەڕەی ١١٥، پـاش مـەرگی مەولـەوی تـێ هەڵکێشـێکی بـۆ شیعرێکی مەولەوی داناوە و ئەڵێت:

فـــەردی مەولـــەوی وەڕەحمـــەت شـــاد بـــۆ
ئامـــا وەیـــادم روتبـــەش زیـــاد بـــۆ

«مســـپاروت وەجـــۆش کـــزەی تاســـەی وێم
وەدوود کـــــەباب بـــــۆی هەناســـــەی وێم»

بە پێچەوانەی ئەو شتەی کە دەیڵـێن، بـە پـێ نووسـراوەکانی ئەحمـەد بەگ بۆ مەولەوی و هـەروەها وەڵامـەکانی مەولـەوی بـۆ ئەحمەدبـەگ، ئـەم خاڵەمان بۆ روون دەکاتەوە کە خوێندەواری ئەحمەدبەگ لە ئاستێکی بـەرزدا

بــووە. شــارەزای زانســتە ئەدەبیــەکان بــووە. هــەروەها زۆربــەی ئاســەوارە بەناوبانگەکانی ئەدەبی فارسی بە باشــی خوێندوەتــەوە و کاریگــەریان لەســەر شیعرەکانی داناوە.

بۆ نموونە ئەو شیعرانەی خوارەوە بۆمان دەری ئەخات کە ئاسـەوارەکانی شێخی سەعدی و غەزەڵیاتی حافز و بەرهەمەکانی نیزامی کاریگەری لە سـەر شیعرەکانی ئەحمەد بەگ داناوە.

سەعدی:

بــە وقــت صــبح قیامــت کــە ســر ز خــاک بــرآرم

بە گفت و گـوی تـو خیـزم بـە جسـتجوی تـو باشـم

ئەحمەد بەگ:

پـــەی تـــۆ جەئەڵـــحەد ســـەر مـــاروون وەبـــەر

جـــە بۆنـــەو تـــۆوە ملـــوون پـــەی مەحشـــەر

نێزامی:

شـــــبا امشـــــب جـــــوانمردی بیـــــاموز

مـــــرا یـــــا زود کـــــش یـــــا زود شـــــو روز

ئەحمەد بەگ:

ئـــەی شـــەو وە ســـەرگەرد جەوانمـــەردیت بـــام

یـــا تـــەمامم کـــەر، یـــا زوو بـــەر تـــەمام

ئەحمەد بەگ بە هۆی نزیک بوونی بە هــەورامانی تەختــەوە و هــەروەها

پێویستی شێعرەکان، زۆرتر لە وشەکانی شێوە زاری ئەو ناوچەیە کەڵکی وەرگرتووە. (هاوتەرازی) ئەم وشانە لە هەورامانی لهۆندا جیاوازە. هەروەها شێوەزاری هەورامانی تەخت رەسەنترە و زۆربەی شاعیرانی بەتوانا، بەشێکی زۆری بەرهەمەکانی خۆیان بەم شێوە زارە داناوە. بۆ وێنە:

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| فارسی | ← | رفت | ← | ریخت | ← | صبح |
| هەورامانیلهون | ← | لوا | ← | مجیی | ← | سۆحەنە |
| هەورامانی تەخت | ← | شی | ← | رێزا | ← | سەبای |

پسپۆڕ، موحەممەد تەقی بەهار، «ملک الشعرا» لە باسی شیعر و شیعرناسی لە ئێراندا یادێک دەکات لە شیعرە بە ناوبانگەکەی «گڵکۆی تازەی لەیل». ئەم شیعرە بە یەکێک لە شاکارەکانی ویژەی کوردی دەزانێت و دوو دێڕی سەرەتایی شیعرەکەی وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی فارسی. بەڵام بە هەڵە بۆی چووە و سەردێری گڵکۆی تازەی لەیلی، بە «گڵ کۆی تازەی گۆڕی لەیل» هێناوە.

هەروا کە لە وەرگێڕاوی شیعرەکەدا هاتووە. مەبەست لە «گڵکۆ» گۆڕ و مەزارە، نە گوڵ. لە نیوە دێڕی یەکەمی سەر هۆنەری شیعر، لە ئەدەبی کوردیدا لە راستیدا پێنج بڕگەیی دێت و بە دووپات کردنەوەی، هاوکێشی لە دێڕەکەدا ساز دەبێت.

ئەوەی کە ئاشنای ئەدەبیاتی کوردییە، شارەزای ئەم شێوەیە، تەنانەت لە نووسیندا پێنج بڕگەی یەکەم دووپات ناکەنەوە نموونەی ئەم جۆرە نووسینە لە دیوانەکەدا زورە. بەڵام لە باسی شیعرناسیدا نیو دێڕی دووهەم و بەیتی دوایی هێناوە و نیو دێڕی یەکەمی نەنووسیوە هەرلەم بەشەدا کە ئوستاد ناوی

شاعیرانی کوردی هێناوه «سەیدی»شی لە هۆزی کۆماسی زانیوه.[1] ئەمـه لـه حاڵێکدایه که سەیید مـەحموود کـوڕی حـاجی سـەید موحەممـەد خەڵـکی خانەگای پاویه «١٢٠٠-١٢٦٥» که ژیان‌نامه و نموونەی ئاسەوارەکەی به تێـر و تەسەلی لـه کتـێبی «حەدیقـەی سوڵـتانی»دا هێناومـه، ئـەم دوو دێـڕەی خـوارەوه کـه مولەممـەعێکی (هـەورامی، عەرەبی)یـه نموونـەی شـیعری «سەیدی»یه

گـــەر سەراســـەر زێڵـــومن گێڵـــیش پەنـــە

غـــیر حبـــک فی فـــوادی لـــیس شـــئ

شـــێخ و پـــیر، مـــەللا و میرگـــرد عاشـــقو

مـــــا علـــــیهم لومـــــــه الاعلـــــــی[2]

ئەو دێڕەی که به زمانی فارسی وەکوو نموونه بۆ هۆنینەوەی شیعری ده بڕگەیی له ناوچەکانی دیکەی ئیراندا هاتووه وەرگێڕانێکی ناتەواوه له گۆرانیـه دڵگیر و خۆشەکانی کوردی که هەردووکیانم بێ هیچ گۆڕانێک هێناوه.[3]

گۆرانی کوردی هەورامی.

وێنـــەی ئاســـکەکەی ڕۆڵـــە گـــوم کـــەردە

پـــەی تـــۆ مەگێڵـــۆ هـــەردە وە هـــەردە

---

١- بهار و ادب پارسی، لاپەڕەی (٩٩، ٩٨) موحەممەد گۆڵبون.
٢- پێشەکی دیوانی سەیدی هەورامی، موحەممەد ئەمینی کاردوخی.
٣- بهار و ادب پارسی، لاپەڕەی ٩٨ و ٩٩ موحەممەد گوڵبون.

«وەرگێڕانی فارسی»

مـــــــی خـــــــواهم بگــــــــردم دره بـــــــه دره

ماننـــــــد اهــــــو، گـــــم کـــــــردم بـــــــره

لە کۆتاییدا بە ئەرکی سەرشانی خۆم دەزانم سپاسی ئەو خۆشەویستانە بکەم کەوا شایانی دروودن. بەرێزان ئـەنوەری سولـتانی، شوکرولـلای بابـان، ڕەشـــیدی شێخەلئیســـلامی[1]. شـــیخ موحەممـــەدی ســـێراجەددینی و خۆشەویستانی دیکە. هەرکام لەم ئازیزانـە بـە هەرشـێوەیەک دەسنووسـیان پێداوم، سەری کۆڕنۆشیان بۆ دائەنەوێنم.

موحەممەد عەلی سولتانی

تاران-١٣٧٨

---

١- بەر لە چاپ و بڵاوبوونەوەی دیـوانی ئەحمـەد بـەگی کۆماسـی هـاوڕێی هونەرمەنـد و ئەدیب و بەهەسـتم سـەیید محەممـەد رەشـیدی شێخەلئیسـلامی (١٣٢٠-١٣٧٨ ه.ش) کۆچی دوایـی کـرد، خوالێخۆشـبوو شێخەلئیسـلامی لـە بنەماڵـەیەکی خـاوەن بـەهرە و هونەرمەند لە دایک بوو. باوکی، خوالێخۆشبوو ئاغە سەیید موحسێنی شێخەلئیسـلامی لـە بوێرانی ڕۆژگاری خۆی بوو. لە پارێزگاری و ئەخلاقدا کەم وێنە بوو.
محەممەد ڕەشید لە دوای تـەواوکردنی خوێنـدنی زانکـۆ، لـە مەدرەسـەکانی دواناوەنـدی شاری سنە دەستی کرد بە وانە وتنەوە لە هونەری خۆش‌نووسیدا لە مامۆسـتایانی لێهـاتوو وەکوو ئوستاد عەلی ئەکبەری کاوە و... بەهرەی بردووە.
ئەو چوار جۆرە خەتە بە تایبەت خەتی نەسـتەعلیقی بـە جـوانترین شـێوە دەنووسـی. لـە لێکدانەوەی ڕاز و ڕەمزی هونەری خۆش‌نووسی زۆر لێهاتوو بوو.
مەزاری ئەو خۆشەویستە لە بەهەشتی محەممەدی، گۆڕستانی شاری سنەیە [کـە مـەکۆی گوڵ و ڕێحانی بەهاری بێت و خوای گەورە لە بەهەشـتی هەتاهـەتایی شـادی کاتـەوە بـە ڕەحم و کەرەمی خۆی].

# ئازیز نەخاوم

ئـــــــازیز نــــــەخاوم، ئـــــــازیز نـــــــەخاوم

بــــــەختم بێــــــدار بی ئامــــــای نــــــەخاوم

دیــــــای وە ســــــینەی پـــــەڕ نـــــە زۆخـــــاوم

وەدڵــــــەی ســــــۆچیای وێنــــــەی کــــــەواوم

وێنــــەی ئــــەفلاتوون نــــەزمت گــــرت زانــــای

ئــــــــازارش چێشــــــــەن دەوا نمانــــــــای

واتــــــت هـــــەر کەســــێ دەردش ئــــەی دەردەن

مــــــەبۆ بــــــەی تــــــەورە عـــــێلاجش کــــــەردەن

دوو عــــــــەناب لـــــــب، دوو بــــــادام چــــــەم

دوو ســــــیب گۆنــــــا، قــــــەترەی ئــــــاودەم

جـــــە پیاڵــــەی غەبغـــــەب ســــافش بکـــــەران

جــــە ســـایەی گـــەردەن پـــەی پـــەی بـــوەران

جـــــەو دمـــــا نــــــە بـــــاخ پادشــــــای حـــــەیان
پـــــــــەی ســـــــاکنی دڵ بکـــــــــەرۆ بــــــــەیان
ئیســــــــــــە ئـــــــــازیزم شــــــــــوخ نــــــــازاران
مــــــن گــــــێڵام جـــــەلای گـــــــردین عــــــەتاران
هـــــــیچ کــــــام جـــــــەی دەوا نمـــــــەگنۆ و دەس
ئێختیـــــــــار وەتـــــــــۆن بـــــــــە فــــــــەریادم رەس
هـــــەنێ چـــــێش واچـــــوون نـــــەزان حـــــاڵ دەرد
مــــن نەڕاگـــــەی تــــۆ چەنـــــدی جـــــەفام بـــــەرد

# بەڕەزای بەرزان

بەڕەزای بەرزان، بەڕەزای بەرزان
بەڕەزای تاتای روی تاش بەرزان

مەلەرزی و باد جە سینەی بەرزان
کەی بە وێنەی زوڵف لەیلەنی لەرزان

زوڵفان سیای عەنبەربار تۆ
عەتر شەوبێزان تار جە تار تۆ

فەسڵێ کە وەباد مەلەرزانەوە
عەنبەر مەورەشان و بەرزانەوە

تۆ سەد جار وە باد ئەگەر لەرزان بی
کەی بە وێنەی ئەو عەنبەر هەرزان بی

دەم مەدەر نە زوڵف عەنبەر بۆی تاتاش
جەی لافە بێ زار جێت مەبۆسا، تاش

زێنـــــــهار تــــــا هـــــــەنی وەرِوی تاشـــــــەوە

کەمتــــــەر بەنـــــدە بـــــەر وەلای تــــا شــــەوە

چــۆن «ئەحمــەد» بەنــدەی زوڵــف تاتــاش بــەر

پــەی زوڵــف تاتــاش، ســەر نــە تــۆی تــاش بــەر

## پیری هەزار داد

پـــــیری هــــــەزار داد، پـــــیری هـــــەزار داد
پـــیری جـــە دەســـتت ســـەد جـــار هـــەزار داد

واوەیـــــلا جـــــە دەســــت جـــــەور و جـــــەفا و داد
تـــــەخت جـــــوانیم یەکســـــەر دای وەبـــــاد

کـــــەم کـــــەردەی بینـــــای ســـــومایی چـــــەمان
قامـــەت وێنـــەی نـــەی خـــەم بیچـــون کـــەمان

ئـــــەو شـــــێوەی رەفتـــــار چـــــون کـــەبک کۆســـــار
ئیســـــــە ناتـــــــەوان وێنـــــــەی کەفتـــــــەکار

رۆخســـــار پـــــەر نـــــوور شـــــەفاف ئابـــــدار
چـــــرچ و قـــــرچ کـــــەردی چـــــون ســـــیادەوار

کـــــوس شـــــنوام ئێســـــە بـــــێگۆشـــــەن
عـــــەقڵ و فـــــام جـــــەلام گـــــرد فەرامۆشـــــەن

نیشـــــانەی پیریـــــن، تـــــەمام خـــــاڵ خاســـــان
چـــــون بـــــاد زەلان جـــــەلام تەواســـــان
تـــــاق جـــــوانی تـــــەمام نـــــازاران
بکـــــەروون کـــــەچی لـــــەیل و نـــــەهاران
بەنـــــدە فـــــەرمایان جـــــە ئـــــەمرێ فـــــەرمان
بـــــین وەقوربـــــانم چـــــون قـــــوچ قوربـــــان
بـــــە پـــــیری کـــــەردەن و پـــــیرم قەســـــەم
پـــــێم رازی نـــــین، هـــــاوار وەجەســـــەم
جـــــە ئۆبۆهـــــەت زۆرێ جـــــوانی
شـــــێر و پەڵـــــەنگان مەکـــــەردم فـــــانی
هـــــەر بیمـــــاری‌یـــــە شـــــەفایێ دییـــــەن
ســـــەبەب هـــــەر بییـــــەن، جـــــوانی نیـــــەن
پـــــیری جـــــە دەســـــتت ســـــەد جـــــار هـــــەزار داد
شـــــەوق جـــــوانیم یەکســـــەر دای وەبـــــاد
زۆر پەنجـــــەی پـــــا جـــــە شـــــەوان تـــــار
مـــــەگێڵام چـــــون بـــــەرق رەعـــــدێ نـــــەووەهار

ئێســـــە چـــــون خەرچـــــەنگ ڕووی رۆشـــــنایی
یـــەک وەجـــەب ڕامـــەن جـــە کـــەم بینـــایی
قـــــەتارەی دەنـــــدان ســـــاف ســـــەدەف بێـــــز
کـــەل و کـــۆم کـــەردی وســـتەنت جـــە هێـــز
ئـــــەودەم چـــــون خونچـــــەی عـــــەتر عەنبـــــەرین
کـــــەردی کـــــڵاوەی ســـــیا چـــــون قیریـــــن
خەتـــــەی زریٚپـــــۆش وەنەوشـــــەی بـــــاخم
کـــــافووری کـــــەردی جـــــە دەســـــت داخـــــم
داران کـــــــافووری مۆشـــــــک فـــــــام وریـــــــن
ئـــــەویچ وارنـــــای نـــــە ســـــەفحەی ســـــەرین
تـــــــەخت بـــــــەخت زەوق تـــــــاق جـــــــوانی
پـــــیری چێشـــــت کـــــەرد، کـــــەردەنت فـــــانی
چەنـــــد خەســـــرەو شـــــاهان نـــــەوجوان زەڕ
چەنـــــد مـــــەه جـــــەمینان زوڵـــــف بـــــۆ عەنبـــــەر
چەنـــد لـــەیلیٚ وەشـــان، چەنـــد شـــیرین شـــێوە
فـــــەرهاد و مـــــەجنوون پێشـــــان بی لێـــــوە

پـــــــیری داخ نیـــــــای و جوانیشـــــــان

تـــــاڵ کـــــەردی تــــەمام زێندەگانیشــــــان

گشـــــت داخ حەســــرەت نەبـــــەر نوێشـــــتەن

پـــەی جوانیشـــان ســـیمای خـــەم رەشـــتەن

پـــیری جـــە دەســـتت ســـەد جـــار هـــەزار داد

تـــــەخت جـــــوانیم یەکســــــەر دای وەبـــــاد

هـــــــەور ئـــــــارەزووم گرمنــــــۆ بـــــــاران

نـــە بـــەرم ســـەندەن، نـــە نیشـــی خـــاران

هـــەرتا خـــەلاس بـــۆ، «ئەحمـــەد» ئەســـیری

جـــــوانی نمـــــەبۆ، هـــــاوار جـــــە پـــــیری

پـــیری، هـــەرتا کـــە ســـەر نـــەنیۆ وەگـــڵ

داخـــــێ جـــــوانی و پیریـــــش هانـــــە دڵ

## جوانیت ویەرد

جوانیـــــــت ویـــــــەرد، وادەی پیریتـــــــەن
شـــــێتە، شـــــادیت شـــــی، هـــــا، زویریتـــــەن
رووی ئـــــەوەڵ ســـــفید، ســـــیابی چـــــوون قـــــیر
ئـــــەوەڵ ســـــیا، ســـــفید بی چـــــون شـــــیر[1]
ددان نـــــەدەهان تـــــاک تـــــاکێوەش مەنـــــد[2]
یانـــــێ هـــــای ددان زێنـــــدەگی وێـــــت کەنـــــد
دووربینەکـــــەی جـــــەم، بیـــــەن تـــــەنگ و تـــــار
یانـــــێ عـــــادەت کـــــەر وە تـــــەنگی مـــــەزار
پیشـــــــانیت لـــــــوان و بـــــــانی زانـــــــوو
خـــــوا حـــــافێزەن پـــــەی هـــــەوار نـــــۆ

---

١- رۆی ئەوەڵ سککەت سیابی چۆن قیر/ئێســـە سیاهیـت سـپیتـــەر جـە شیـــر (ر، ژ، ١٤٩، ل ٢)
٢- دەندان جە دەهان یەک تاقێ نەمەند ر، ژ، ١٤٩، ل ٢.

فکـــرێ دەروەکـــار جـــەی وەرتـــەر کـــەردەت
بـــــاوەر وە خـــــەیاڵ عـــــومرێ ویـــــەردەت
خەجاڵـــــەت بـــــەزم هـــــام فەردانـــــەنی
ئەنگۆشـــت نمـــای بـــەین ئێـــنس و جانـــەنی[1]
هـــــەر ســــــەرزەمین پامنیـــــەی نـــــەلێش
فـــەریاد موانـــۆ هـــەر ئەشـــیا پـــەی وێـــش
عاڵـــــەم هەراســـــان، تەقســـــیر باریتـــــەن
مەلایـــــەک حـــــــەیران شەرمەســـــــاریتەن
قـــەبریچ پـــەی ئـــەعزات نـــە ئینتێـــزارەن
وە سیاســـــەنگ بـــــای چونـــــت قـــــەرارەن
میـــزان جـــە گونـــات دڵ پـــڕ ئەندێشـــەن
فکـــرێ گـــرانی و بـــەن بریـــان پێشـــەن
تـــا نـــیم گیـــان مەنـــەن تۆبـــە کـــەر بـــە دڵ
ســـــەوا، «ربنـــــا اغفـــــر» چـــــە حاســـــڵ
نیمـــەیێ نیمەشـــەو جـــە خـــاو بێـــدار بـــەر
پـــەی جەســـتەی خەســـتەت زاری و زگارکـــەر

١- ................. هام فەردان نەبی/................. ئێنس و جان نەبی.

دەســـــت موناجـــــات، هـــــورداره نـــــه دڵ
بنـــاڵ نـــه دەرگـــای حـــل کـــەردەی موشـــکڵ
برێـــــزه ئەســـــرین جـــــه چـــــاره شـــــومی
بووانـــــه فـــــەردین خاڵـــــۆی مەعـــــدوومی[1]
«یـــا جـــه گونـــای مـــن کـــەرەم ئاوانتـــەر
رەحمـــەت جـــه تـــاوان مـــن فەراوانتـــەر!
هـــــەر تـــــۆنی و تـــــاک، دانـــــا و تـــــەوانا
تـــۆم هـــەنی هـــەنی ئـــەو کـــێم بـــۆ هانـــا»
بـــەڵ چـــون کـــەریمێ شـــای کـــەرەم بـــێشـــۆ
بویـــــەرۆ جـــــه جـــــۆرم شەرمەســـــاری تـــــۆ
جـــــه گۆزەشـــــتەی تـــــۆ سەرگوزەشـــــت ئـــــارۆ
جـــــەو بۆزورگتـــــەرەن ئـــــەو وه ڕووت بـــــارۆ
یـــــا قـــــائم بـــــه زات یەگانـــــەی بـــــێچـــــوون
ئەگـــــەر نەبەخشـــــیم، خەلاســـــیم جـــــه کـــــۆن

١- ئەم دێرەی مەولەوی له زۆربەی دەسنووسەکاندا بـه نـاوی موناجـاتی مـەولانا خالیـد نووسراوه.

«ئەحمـــــــەد» مەتەرســـــــە گونـــــات عەزیمـــــەن

ئەحمـــــــەد شـــــافێعەن، خـــــالق کەریمـــــەن[1]

١- ئەم شیعرە بە ئەم سەردێڕە:
دله، جوانی وییەرد وادەی پیریتەن/شێتە! شـادی شـی، ها زویریتـەن
لە ر، ژ، ١٤٩، ل ٢ بە شێوەیەکی ناتەواو لە حەوت دێڕدا بـە نـاوی مـیرزا شـەفیع هـاتووە ئەگەرچی (قالب) شێعرەکە بە تەواوی لەگەڵ شێوازی شیعری میرزا جیاوازە و تایبـەت بـە ئەحمەد بەگە، جێگای سەرسوڕمانە کە بە هەڵە بۆی چوون، خاڵی دیکەیش ئەمەیە کە تێ هەڵکێشی فەردین مەولەوی و نازناوی شاعیرە کە لە ئاخری شێعرەکەدا ئەم بۆچوونـە ڕەد دەکاتەوە.

# فەڵەک بەردەنم

فەڵـــــەک بـــــەردەنم فەڵـــــەک بـــــەردەنم
ڕاســـەن ســـوجدەی دەیـــر تەرســـا بـــەردەنم
دەســــــتم دامانـــــت دیـــــدەم و لـــــەیلات
وادەی وەفاتـــەن ئێزهـــار کـــــەر وەفـــات
وەختـــێ مـــەورام و ئەلحـــەد ســـەرای نـــۆ
جـــــە داخ تـــــووە مشــــووم و گڵــــکۆ
جـــــە بۆنـــەی کـــارێ، شـــای وەفـــاداران
قـــەدەم رەنجـــە کـــەر وەســـەر مـــەزاران
هـــەر قـــەبرێ دوودش نـــە عـــەرش ویـــەردەن
تـــەپ و دووی دووکـــەڵ عاڵـــەم قـــڕ کـــەردەن
بـــــزان و تـــــاقی مـــــەزار منــــەن
ئـــەو دوو دووی دڵـــــەی ئـــەوگار منـــەن

نـــــەواچی مـــــەمات نــــە ســــەرای گڵـــکۆن
حـــــەیات و مـــــەمات، ئامـــــا و لـــــوای تـــــۆن
بخرامـــــــە و نـــــــاز و ســـــــەر جـــــــەنازەم
بکـــــــەرۆ حـــــــەیات، مـــــــەمات تـــــــازەم
ســـــاتێ مەدارکـــــەر نــــــە پـــــای مــــــەزارم
گـــــۆشدەر و ناڵــــــەی دڵــــــەی ئــــــەوگارم
تـــــا داد و بێـــــداد، هێجـــــران بـــــاڵات
مـــــەحروومی دیـــــدەم نـــــە گـــــەرد پـــــاڵات
نـــــەمانۆ نـــــەدڵ عـــــەرز کـــــەرۆ وەتـــــۆ
بـــا نەشـــۆ وەحەشـــر، چـــون شـــی وەگڵـــکۆ
«ئەحمـــــەد» دەرد دڵ ئـــــەر واچـــــۆ وەتـــــۆ
ســـەر ئـــازاد مـــەبو نـــە ســـەرای گـــڵ کـــۆ

## چراخم بەرزەن

چراخم بەرزەن، چراخم بەرزەن
ئەر سەد چون هەڵوەن دەماخت بەرزەن
مەتڵەبێ دارو نیازم عەرزەن
عەرزێ عاجزان وە حاکم فەرزەن
عەرزم هەر ئێدەن شای نەونەمامان
سەردار دەفتەر خەیاتەی خامان
توپی شێوەی خاس بێئەندازەوە
پی دیەی شەهلای چون شابازەوە
پی قەوس قەتران دەور دیدەوە
پی گۆنای گوڵ رەنگ حەق رەژیدەوە
پی کەچی سەروێن هەزار رەنگەوە
پی شێوەی شیرین شوخێ شەنگەوە

پـــی مینـــای گـــەردەن ســـاف بـــێ گـــەردەوە
پـــی شەعشـــەعەی شـــەوق لیمـــوی زەردەوە
وەی پێڵـــــوی ماشـــــتەی قەترانیـــــەوە
وەی ئامشـــــۆی خــــــاس ڕای کانیـــــەوە
وێـــت مـــەحبووس کـــەردەن جـــەلای پـــیرەوە
چـــــون بیگلەربـــــەیگی وە زەنجـــــیرەوە
بـــێ ســـەیدەن عەینـــەین مـــەخموور مەســـتت
بـــێ خـــازن مەنـــدەن گـــەنج دەربەســـتت
ســـپای ئەنجۆمـــەن دەور چـــای زەمـــزەم
بـــێ ڕەونـــەق مەنـــدەن گێرتـــەن بـــارێ خـــەم
لـــــەعل ئەحمـــــەریت ئەســـــفەر منمـــــانۆ
کـــەس نیـــەن قیمـــەت ئەســـلیش بزانـــۆ
مـــن پـــەرێ تۆمـــەن شـــوخێ جـــەمین جـــام
جـــــۆش جوانیـــــت زوو مـــــەبۆ تـــــەمام

بـــە دیـــدەت قەســـەم دنیـــا درەنگـــەن
گـــــەردش دەوران و هـــــەزار ڕەنگـــــەن

هــــا ئیســــە توغیــــان نەوجوانیتــــە
وادەی عــــەیش و نــــۆش کامەرانیتــــە

ئیســــە هــــای نـــەجۆش ئـــەوەڵ جۆشـــەدا
نـــەی تــاف تۆغیــــان فـــام و هۆشـــدا

مەحبووســـی لای پـــیر، وەســـەن کافیـــەن
مـــۆدارات بـــاعیس بـــێئینســـافیەن

چـــون وێـــت پەســـەن کـــەر یـــەک نەونـــەمامێ
نـــەمام نـــەوخێز شـــیرین کـــەلامێ

بـــەو شـــەرتە حـــاڵ زان جـــەفا بـــەردەبۆ
مەشـــقێ عەشـــق نـــە لـــەوح مـــەجنوون کـــەردەبۆ

بزانـــۆ بـــە قـــەدر خاڵانـــێ ئـــاڵات
بـــاڵای وێـــش کـــەرۆ پشـــتان بـــاڵات

ببـــۆت بـــە خـــازن گەنجینـــەی دەربەســـت

گـــەنجت و بـــێرەنـــج بـــاوەرۆ وەدەســـت

تـــۆ لـــە شـــەوق ئـــەو، ئـــەو لـــە شـــەوق تـــۆ

ڕۆبـــــەڕۆ عەشـــــقت زیاتـــــەر مـــــەبۆ

خاڵانـــــت مشـــــۆ وەچـــــاخ وەریـــــن

مـــــوواچی «ئەحمـــــەد» هـــــەزار ئافـــــەرین

## قیبلەم خاڵ تۆم

قیبلـــەم خـــاڵ تـــۆم، قیبلـــەم خـــاڵ تـــۆم
بـــە قورئـــان قەســـەم کوشـــتەی خـــاڵ تـــۆ
زامـــدار خەســـتەی پـــای دەسمـــاڵ تـــۆم
ســـەرعی، شـــەیدای دەســـت لال بـــاڵ تـــۆم
پێکیـــای پـــەیکان مـــوژەی ســـیای تـــۆم
بـــێهـــۆش و خـــامۆش وەلای دیـــای تـــۆم
جـــە رۆ بـــێخـــۆراک شـــەو بـــێخـــاو تـــۆم
ئـــــەر موسۆڵـــــمانی، دڵ کـــــەواو تـــــۆم
ئەگـــەر حـــاڵ زانی، مـــن بـــێحـــاڵ تـــۆم
ســـەنعانم ئـــازیز، دیـــن بـــە تـــاڵ تـــۆم
شـــێتم هـــەم شـــەیدای یەخـــەی واز تـــۆم
فیـــدای ئەگریجـــەی مێقـــراز گـــاز تـــۆم

قـــەیس ئـــەراگێڵ دیـــدەی مەســـت تـــۆم
مـــەحبووس دوســـاخ هـــەم پابەســـت تـــۆم
بـــەهرام! تـــا وەحشـــر نمـــەدپۆش تـــۆم
قوربـــان! مـــن غـــولام حەڵـــقەگۆش تـــۆم
فـــەرهادێ کۆکـــەن، جەفابـــەردەی تـــۆم
عاڵـــەم مزانـــۆ وێـــڵ و هـــەردەی تـــۆم
کەســـم نەمـــەردەن عازیـــەت بـــار تـــۆم
دووروا دوور جـــە تـــۆ گرفتـــار تـــۆم
جـــەفای بـــێ‌ســـفات ئـــازیز تـــا وەکـــەی؟
بـــۆی ســـەردی وەفـــات ئـــازیز تـــا وەکـــەی؟
تاکـــەی رۆخســـارم زەرد بـــۆ وێنـــەی بـــەی
تاکـــەی هەناســـەم بـــەیۆ پەیاپـــەی
تاکـــەی چـــۆن مـــەجنوون لونـــگ خـــەم پۆشـــم
تاکـــەی چـــون کـــوورەی ئـــاهیر بجۆشـــم

تاکـــەی لەیلەکـــەم بـــەرگم پـــەڵاس بـــۆ
تاکـــەی تـــەن ڕێـــزە ڕێـــزەی ئەڵـــماس بـــۆ
تاکـــەی هێجرانـــت بـــەی تـــەور جـــاری بـــۆ
تاکـــەی خـــەدەنگت نـــە دڵ کـــاری بـــۆ
تاکـــەی بەرگەکـــەم قـــەڵاخی پـــۆش بـــۆ
تاکـــەی عـــەیش و نـــۆش جـــەلام خـــامۆش بـــۆ
ئـــەر مروەتـــت هـــەن وەســـەن کافیـــەن
چینـــە زیاتـــەر بـــێ ئێنســـافیەن
وەســـەن، کافیـــەن ســـەوڵ ســـایەدار
ڕەحمـــێ کـــەر وەحـــاڵ ئـــی بەنـــدەی هـــەژار
تاکـــەی جـــە زوان لاڵ بـــۆ پـــەی حاڵـــت؟
ڕەحمـــێ وەجەســـتەی ســـفتەی ئەوداڵـــت
هـــەی زەڕڕەی ســـفتەی لێـــوە بمـــانۆ
مەشـــهوور بـــۆ نـــەعام گشـــت عاڵـــەم زانـــۆ

گشـــت عاڵـــەم زانـــۆ زەدەی شەســـت تـــۆم

قـــاتڵ! مـــن مـــەقتووڵ دیـــدەی مەســـت تـــۆم

مـــۆهرەن وەســـەلام «ئەحمـــەد» داخ نـــە دڵ

ئـــــازیز! ســـــامازە داخ بـــــەرۆ وە گـــــڵ

## چراخ ویەردەن

چراخ ویەردەن[1]، چراخ ویەردەن
هێجرانت یەک جار جە حەد ویەردەن
رووی وەسڵت هەر بیم ئەی رووەپێم بی
جەو بۆنە هەر ڕو ڕوڕو خودێم بی
ئیسە ها فەڵەک نیشان دادەن پێم
ئاخ ترسیاکەی گیر ئاوەردە وێم
ئەمجارکێ تاقەت دووری تۆ دارۆ
دەک بەرق غەزەب وەبەختم بارۆ (الف)
پەژارەت[2]، شادیم جە بێخ ئاوەردەن
دووریت خەیمەی دڵ ڕیشەکەن کەردەن

١- خالۆ ویەردەن... ر، ژ ٨١، ل ٤.
٢- پەژارەت... ر، ژ ٨١، ل ٤.

فیراقـــــت فـــــەرقم وە تووتیـــــا کـــــەرد
جیائیـــت ئـــەعزام جـــە هـــەم جیـــا کـــەرد
وەسواسـەت[1] بـەو تـەور نـێش دان نـە جـەرگم
و مـــــــەرگت قەســـــــەم رازی وەمـــــــەرگم
وێـت بـدەر ئێنسـاف، خاڵـۆکەی خوشـخۆ (ب)
مـــــەردەن خاســـــتەرەن یـــــاخۆ دووری تـــــۆ
مـــــەردەن یـــــەک ســـــاتەن ئەرواحەکـــــەی وێم
دووریت هـەر ساتێ سـەد مەرگـەن پـەرێم (پ)
مـەر جەسـتەی خەسـتەی مـن جـە فـوولاد بـۆ
یەنـد دووریـت وینـۆ هێمـای هـەر شـاد[2] بـۆ
دەک رەحمـەت و قـەبر گشـت سـینە سـافان
خوسووسـەن، «یـەعقووب» میرزاکـەی جافـان
«چەرخێ چـەپ چـەنیم ڕاس بەسـتەن کەڵـەک
چمـــان ســـەنگم دان و مینـــای فەڵـــەک»[3]

---

١- وسواسەت... ر، ژ ٨١، ل ٤.
٢- لە، ر، ژ ٨، ل ٤.
٣- ... گاهیوە بانە، ر، ژ ٨١، ل ٤.

دایم پـــەی تۆمـــەن، هــــا، جـــە بەهانـــە

گاهـــێ ئێســـفەهان، گاهـــێ جـــە بانـــە

نمـــەدوم فرســـەت ســـاتێ و بـــێخـــەم

گـــــەرد پالاکـــــەت بمالـــــوون وەچـــــەم

یـــا شـــەوێ شـــین کـــەم وەشـــەو نالـــینت

یـــــا روویـــــێ رۆکـــــەم و زاری و شـــــینت

یـــــا نالـــــەم چـــــەنی نالـــــەت بخێـــــزۆ

یـــا دیـــدەم پـــەرێت ئەســـرین بـــرێزۆ (ت)

یـــا شمـــەی جـــە شـــەرح دەوری دووبـــارە

داخ دەرد هێجـــــر[1] دڵـــــەی ســـــەد پـــــارە

عێشـــوەی کرێشـــمەی حـــور جـــەمین گـــوڵ

عـــــەرزە[2] و پـــــابوس پـــــەی تەســـــکین دڵ

---

الف) جەستەم، (نوسخەی دیوانی مەولەوی) ب) نەونەمام نۆ ... (نوسخەی ب) پ) مەرگێ مدۆپێم، (نسخەی ب)

١- داخ، هیجر و وەسڵ، ر، ژ ٨١، ل ٤.

٢- ... کەم، ر، ژ ٣٤، ل ٢.

چـــــەپ گــــەرد نمــــازۆ ســــاتێ[1] فەراغــــەت

ئــەی خــوا[2] یــا وەســڵ یــا مــەرگ یــا تاقــەت

١- نمازوم دەمێ، ر، ژ ٢٤، ل ٢. ت... ئەسرێ پەرێت برێزو.

٢- سا، خودا، ر، ژ ١٢٤، ل ٢.

## چراخ ویەردەن

چـــــراخ ویـــــەردەن، چـــــراخ ویـــــەردەن
حـــەرفێوەم جـــە شەســـت زەبـــان ویـــەردەن
زەبـــــانم لاڵ بـــــۆ غەڵـــــەتم کـــــەردەن
گوویـــا جـــاش نـــە دڵ نازکـــت کـــەردەن
مـــن حـــەرفم پـــەرێ نەســـیحەت وانـــان
تـــۆ نەســـێحەتت وە بـــێجـــا زانـــان
خـــەجڵ مەنـــدەنان جـــە واتـــەی بـــێ جـــام
جـــە بـــێ جـــای بـــێحـــەد، هێجـــران ســـەرئەنجام
ئێســـە مـــن پـــەرێو عـــوزر تەقســـیرات
شمشـــێر نـــە گـــەردەن، ئامـــام وە ردەرگـــات

چوونکــه مــن بــێ‌جــای بــێ‌حــەدم کــەردەن

بفـــــەرما جـــــەلاد بـــــدۆم نـــــە گـــــەردەن

تۆبـــە بـــۆ جـــە دەســـت مـــۆژەی ئەڵماســـان

هـــەنێ نـــەواچوو بـــێ‌جـــای خـــاڵ خاســـان

وەگەرنـــــە حەیفـــــەن ئـــــەی بەرگوزیـــــدە

مدیـــەی و بـــێ‌جـــای گـــەدای غـــەم دیـــدە

## ئەرێ ئازیزم نەونەمام نۆ

ئـــــــەرێ ئــــــازیزم نەونــــــــەمام نــــــــۆ
حەرامـــــەن ئـــــی دەهـــــر دنیـــــا وە بـــــێتـــــۆ
بینـــــــایی دیـــــــدەم و دیـــــــدەی مەســــــتت
و تــــــاق ئـــــــەبرۆی وەهـــــــەم پەیوەســــــتت
وە بـــەرزی قامـــەت نـــەی ئاســـای نـــەی تـــووڵ
وە سێلســـێلەی پـــێچ، حەڵـــقەی زۆڵـــف لـــوول
بــــە شــــەرت و وەفــــای وەســــەر نەبــــەردەت
بــە عەهــدوو ســەوگەند چــەنی مــن کــەردەت
یەگشـــــت ســـــەوگەند بـــــۆ بینـــــایی دیـــــدەم
خـــــەرام نـــــەوخێز ، ئـــــەی بەرگۆزیـــــدەم

ویـــران مالـــەکەی، دلـــەکەی کـــۆس وەکـــۆس

ســـــفتەن وەئـــــایر دووری دیــــــدەی دۆس

تالـــــەی مـــــن یەکســـــەر ئاســـــارش بریـــــان

دیــــرەک ســـــەر تـــــاق ســـــتوونش ڕمیـــــان

ویـــــش و بـــــێ‌یاگـــــە مەنـــــدەن و مـــــاتڵ

زاروو پەرێشـــــــان مـــــــەدهووش و خـــــــەجڵ

ئێســـــــە نەوەتـــــــەن قـــــــەدیم فـــــــەرارەن

ئومێـــدش بـــە لۆتـــف نـــیم نیگـــای یـــارەن

رایـــــێ وەیانـــــەی ســـــفتە کـــــۆش بـــــەرۆ

فکـــرێ پـــەی دەرمـــان دەردێ نـــۆش کـــەرۆ

ئـــــازیزم! قوربـــــان! بـــــالا تـــــووڵ نـــــەی!

بـــاوەس بـــۆ جـــەفات، رەحمـــەت بـــۆ، تاکـــەی

ئـــــــەحیا دەرەوە حـــــــەیاتش جـــــــە نـــــــۆ

وەقـــــەترەی عـــــەرەق بـــــەین دوو لیمـــــۆ

ئاوپاشـــی کـــەرە هـــا، وەش، یـــەک نەفـــەس

بـــــا وە تـــــەمامی نـــــەبۆ وە قەقنـــــەس

## چراخم شەوبۆ

چـــــراخم شـــــەوبۆ، چـــــراخم شـــــەوبۆ

شـــەوێ نـــە شـــەوان شـــیم پـــەرێ شـــەوبۆ

هـــەراس بـــیم جـــە داخ شـــەوبۆی زۆڵـــف تـــۆ

ناعـــەلاج چنـــیم دەســـتەی شـــەوبۆی کـــۆ

شـــایەد بـــۆی زوڵـــفت کـــەمێ بـــەیۆ لـــێش

بەڵـــکەم زامـــانم کەمتـــەر کـــەران ئـــێش

چەنـــد وەدڵ نیـــام بـــۆ وەبـــۆی شـــەوبۆ

بـــۆش مـــدا، ئـــەمما نـــەک چـــون زوڵـــف تـــۆ

فیـــدای ئـــەو شـــابام، تـــۆش ئیجـــاد کـــەردەن

زۆڵـــفانت گـــرەو جـــە شـــەوبۆ بـــەردەن

ئــەر شــەو، بــۆی زۆڵــفت بــدەم وە شــەوبۆ

دەیــری بــام نــە جــەمع دەیریانــێ کــۆ

«ئەحمــەد» تــا زێنــدەن هــەر ســەرگەردانەن

بــێشــەوبۆی زۆڵــفت وێڵــی هەردانــەن

## قیبلەم تەنیای تاق

قیبلــەم تــەنیای تــاق، قیبلــەم تــەنیای تــاق
قیبلــەم بــە شــق حــەق تاقــێ تــەنیای تــاق
تــاق جــەو تــۆڕڕەی لــوول وەردەی تــاق تــاق
تـــاق جـــەو غۆنچـــەی نـــادرەی ئافـــاق
بـــدەر، وەبـــاوە ئـــی تـــاق پـــەی ئـــەو تـــاق
تـــا شـــاد بـــۆ وە تـــاق ســـەرلوح بـــان تـــاق
بـاوەس سـۆز بـەرز بـۆ، جـە سـەودای فێـراق
وەس نالـــەش گێلـــۆ پێـــدا، نـــەنۆ تـــاق
وەرنــە بــە تــاقی «ئەحمــەد» پــەی ئــەو تــاق
هــەر تــاق تــاق مــاچوو چــون ســەر تــاق تــاق

## تا وەسەر یار بۆ

تـــا وەســـەر یـــار بـــۆ، تـــا وەســـەر یـــار بـــۆ

پـــەی یـــار ئـــەو خاســـەن، تـــا وەســـەر یـــار بـــۆ

مـــەیلش بـــە وێنـــەی ســـەیل وەهـــار بـــۆ

دووری یـــار پـــەرێش چـــون ژارمـــار بـــۆ

چـــوون کـــوورەی ئـــاهێر بجۆشـــۆ وەتـــاو

وەبـــێ یـــار نەشـــۆ، شـــەو نـــە دیـــدەش خـــاو

ئـــاه ســـەرد کێشـــۆ شـــەوان جـــە جێـــدا

بـــێزار بـــۆ نـــەوجا یـــار نـــەبۆ تێـــدا

## دیدەی بێخەوان

دیـــدەی بـــێخـــەوان، دیـــدەی بـــێخـــەوان
هـــام دەنـــگ نالـــەی دیـــدەی بـــێخـــەوان
کـــەس نیـــەن بێـــدار جـــە نیمـــەی شـــەوان
مـــــەر بــــاد شــــەوخێز یــــا تــــاف رەوان
یــــــەکێ جەوانــــــە منــــــەنان حــــــالا
پەیوەســــتەن تــــا ســــوب نالــــەم و بــــالا
غـــەیر جـــە بـــاد ســـۆبح تـــاف ســـاف نـــەفس
نمـــەیۆم نـــە گـــۆش تاســـوب ســـەدای کـــەس
ئومێـــدم بـــە تـــۆن تـــاک تـــەنیای فـــەرد
یـــا هـــامراز، یـــا مـــەرگ، یـــاخو، دەوای دەرد

## ساقی! ساکەی مەی؟

ســاقی! ســاکەی مــەی؟ ســاقی! ســاکەی مــەی؟

فیدات بام ساقی، سا کـەی مـەی؟ کـەی مـەی؟

جـــەرگم کەبابـــەن، رەنـــگ زەردم چـــۆن بـــەی

ناڵـــــەی دەروونم بەرزتـــــەرەن جـــــە نـــــەی

ســــــاقی ســــــایەی بی بـــــەنی کـــــەباب نی

ئامانــەن ئــەر مــەی تــویچ بــە مــەی چــی مــەی

ئـــەر بـــەی، بیـــەن یـــار جـــەمین جـــام مـــەی

جـــەور هیجرانـــان، بـــۆ مـــن بـــەیان تـــەی

ئەقـــەل جـــە ڕاهـــێ بـــە جـــام دەور مـــدەی

بـــەی، بدیـــە و حـــاڵ ئـــی رۆخســـارەێ بـــەی

چـــــەنی ســــــۆز دەرد واوەیـــــلای وەی وەی

نــیم گیــانش مەنــدەن بــەڵ بــۆ، بــەی بــۆ تــەی

بـــە لۆتفەکـــەی وێـــت چـــەم پیاڵـــەی مـــەی

«ئەحمـــەد» جـــەو بەیـــە بـــێ نەســـیب نەکـــەی

## شیرین زۆحاکەن

شـــــیرین زۆحاکــــەن شـــــیرین زۆحاکـــــەن

مارانــــــت چـــــون مــــــار دۆش زۆحاکـــــەن

ســـــەودای دەیجـــووری حۆســـنت جەلاکـــەن

«لا تَخـــف» نـــە خـــەوف مەحشـــەر بـــەرپا کـــەن

نـــــازۆکی ئـــــەبرۆش ئایـــــەی «لافتـــــا»ن

مەرســای قـــەوس ســـەیف بۆڵـــەند هێممـــەتان

دیـــــدە، دیـــدەی جـــەیر نەخۆتـــەن چـــەردە

نگـــــا چـــــۆن شـــــاباز شـــــکاران کـــــەردە

شـــاماران دوو تیـــپ ســـپای شـــەر ئـــەنگێز

ســـــەر بـــاڵ شـــــەمقارِ قـــــەزاجوی تۆنـــدخێز

بـــینی نـــەقش کێلـــک ئوســـتاد قـــەدیم
پـــەی زینـــەت کـــەردەن ســـیبێ وە دوونـــیم
بـــاڵ دەورســـــیب ســـیم ســـادەی خـــاس
حـــــەیوچـــان پێـــوە بیـــەن ورەقـــاس
بـــە شـــنۆی نەســـیم زۆمـــرەی حـــەی تـــاران
هوجـــــووم مـــــاوەرۆ وەپـــــای شـــــاماران
گـــا، مشـــیان وەســـەر ســـەرچەشمەی زەمـــزەم
گـــا حەڵـــقە مـــەدان نـــە حەواڵـــی دەم
دەم غۆنچـــــــەی نـــــــازک رەوزەی رزوانی
کەیلـــەن جـــە لۆلـــۆی یـــاقووت کـــانی
دەنـــدان دوڕدانـــە نـــە پـــەنای یـــاقووت
گەنجینـــەن یـــا دەم، یاقووتـــەن یـــاقووت
بـــۆی نەفـــەس نەســـیم عیســـای رۆحـــانی
ئـــەحیا کـــەرۆ جێســـم ســـەد ساڵـــەی فـــانی

شـــــــەفەتەین، شـــــــفای دەرد بیمــــــاران
مەرهــــــەم پـــــەریٚ زام خـــــاتر ز گــــاران

خاڵـــــیٚ جاگێرتـــــەن نـــــە حەواڵـــــی دەم
چـــون هێنـــدوو بەچـــە نـــە دەور زەمـــزەم

ئـــەو خاڵـــە بـــاعێس شـــین بـــیٚشـــۆمەن
وەسواســـەی شـــەوان پـــەژارەی ڕۆمـــەن

هــەر ئــەو خاڵــە بــیٚ، قــەیس بــەرد وەســەحرا
ســـــــەنعانش کێشـــــا وەڕای کلیســــــا

بـــۆی ئـــەو خاڵـــە بـــیٚ وەشـــیرو یـــاوا
لاحــــەیا ســــینەی خۆســــرەو شــــکاوا

تۆپـــەی زنـــج نـــە تـــەرح شـــەمامەی تـــڵا
تـــڵای تـــازە قـــاڵ خاســـەی پـــەڕ جـــەلا

پێـــــوە مەدرۆشـــــۆ زنـــــج و ســـــیم و زەر
مەر شـەوقیٚ کـۆی نـوور جۆقـەی شـای قەجـەر

گــــەردەن چـــون گـــرە، میــــل جـــە مۆغـــاران
ســـــەلەج ســـەیقەل ســـاف، ســـادەی کۆســـاران

ســـیما و ســـینە و بـــاڵ بـــاهووی جـــەیر و مـــەم
چـــون چـــل چراخـــان شـــەوق مـــدۆ وەهـــەم

نـــــاف، تەجربــــەی دەس، حـــــەکاکی قــــەدیم
قتــــووی مــــەعجوونات ئەرەســــتووی حـــــەکیم

وەلحاســـڵ نـــە فـــەرق تـــا کەعبـــەی رەجلـــەین
عـــــەیب تێــــدا نیــــەن و گــــەردەنم دەیــــن

یـــارەب بـــە حاجـــەت شـــای بـــوراق ســـوار
شـــیرین مـــەحفووز کـــەی جـــە دیـــدەی بـــەدکار

هەرکـــەس جامـــێ مـــەی نـــەودەم بنۆشـــۆ
خـــــزر ئاســــا، بــــەرگ ئــــەحیا بپۆشــــۆ

«ئەحمـــەد» تـــا زێنـــدەن هـــەر دۆعـــا گووشـــەن
مـــــەدهوش شـــــەماڵ عـــــەتر گیسووشــــەن

## تلووع کەر جە نۆ

تلـــووع کـــەر جـــە نـــۆ، تلـــووع کـــەر جـــە نـــۆ

فێـــدای تەلعـــەتت، تلـــووع کـــەر جـــە نـــۆ

هـــەر کـــەس وە شـــێوەی عەشـــقت پـــەی بـــەرۆ

شـــێتەن جـــە عەشـــقت لۆمـــەو مـــن کـــەرۆ

بـــەو شـــێوەی شـــیرین کـــێ بـــۆ جـــەلای تـــۆ

نـــەدا فـــام و هـــۆش مەگـــەر وەحـــش کـــو

تـــای زوڵـــفت نـــە پـــای ئـــەبروت پەخشـــان کـــەرد

ئەســـرین، دامـــانم وە بەدەخشـــان کـــەرد

وەبـــۆی نەســـیمش نەشـــئە بـــیم وەشـــاد

ئەسڵـــەن رووی دووریم نـــەمانا وەیـــاد

دەمـــاخم ســـەروەش چـــون ســـەوزەی ســـاوا

کـــەیفم ســـەر وەپـــای فەڵـــەک مەســـاوا

ناگـــــا پیشـــــانی دڵ داش و هەمـــــدا

پەیاپـــەی ئەســـرین ئامـــام وە چەمـــدا

ئـــازیز یـــە ئەفســـوون مـــەهجووری تـــۆ بـــێ

یـــە مولـــکێ نـــارێ ڕووی دووری تـــۆ بـــێ

هـــەی ڕای حـــەیاتم تـــورڕەی دیـــدە مـــەس

هـای، نـە کـەردە بـوت وەرنـەدەی جـە دەس

## نە ویرانەی دڵ

نـــــە ویرانـــــەی دڵ، نـــــە ویرانـــــەی دڵ
قیبلـــــەم نگاکـــــەر نـــــە ویرانـــــەی دڵ
دیـــدەم، بینـــائیم وینـــەی پـــەڕەی گـــوڵ
لادێـــی پەرســـە حـــاڵ، خەســـتەی داخ نـــە دڵ
دەردێ نێـــزەی ســـەخت فێـــراق بـــاڵات
گـــەرمی مـــەحرووِمی گـــەرد پـــا و پـــاڵات
جەوســـاوە ئـــازیز جیـــا بـــیم جـــە هـــەم
جـــە خـــەم هەوارگـــەی مـــەیلت گێرتـــەن تـــەم
بـــەدەن جـــە دووریـــت بیـــەن وە قەقنـــەس
گیـــان نـــە جـــای ســـەختەن، نمـــەیوم وەدەس

وەرنـــە مـــن تـــەعجیل یـــا ئـــەو بـــێقـــەرار

نـــە مەســـکەنێ وێـــش نەکـــەردەن فـــەرار

نــە ســاڵ و نــە مــاه نــە حەفتــە و نــە شــەو

نـــە ســـاتێ ئـــارام، نـــە دەقێقـــێ خـــەو

نــە مەشــوم نــە چــەم خاڵــۆ جــە دووریــت

هــەر ئێــد مــەواچوون داخ نــە مــەهجووریت

ئــەی شــەو وە ســەرگەرد جوانمردیــت بــام

یـــا تـــەمامم کـــەر یـــا زوو بـــەر تـــەمام

ئەمشـــەو ئەسڵـــەن ویـــر بـــەیانیت نیـــەن

وێنـــەی هێجـــرێ مـــن پایانـــت نیـــەن

شـــــنەفتم شـــــەوان فێـــــراق تـــــوول دارۆ

یــەکجا رەنــگ وەی رەنــگ غــەزەب لێــت وارۆ

یـــا فەلـــەک چـــارەم ســـیا پـــەروەردەن

یــا خــەیر تــو کلیــد ســوبحت گــۆم کــەردەن

رۆڕۆ مـــــــــــــــــــاچوو وە ڕۆڕۆ و زاری
مـــــەر ڕۆی ئـــــاخری، ئــــاخر نــــــەداری؟
ســـا، دەی، ئـــاخر بـــەر، یـــا ئـــاخر بـــاوەر
ئـاخر، گیـان جـە دەس دووریـت خـەلاس کـەر
شـــەو و ڕۆ جـــە داخ زۆڵـــف و کوڵـــم تـــۆ
داوا و باسمـــــــەن چـــــەنی شــــــەو و ڕۆ
چـــون شـــەو، شـــێوەی زۆڵـــف مۆشـــکینت دارۆ
رۆ، کـــــــەمێ شــــــوعاع جــــــەمینت دارۆ
وەســــەرگەردت بـــام ئـــاوات واســــتەی وێم
جــــــوانیش تەســــکین نمــــەیاوو پــــێم[1]
ســــەوگەند بـــەو تاڵـــی شـــەوان فێراقـــت
وەســــۆزی هێجـــران نــــە ئاڵــــەم تاقـــت[2]

١- دەوای نیش تەسکین نمەیاونی پێم «ڕۆژنامەی کوردستان» ژمارەی ٧٢ لاپەڕەی ١١.
٢- لە ڕۆژنامەدا نەبوو.

دووری تـــۆ وەی تـــەور توانـــام ســـەندەن
رای قافیـــەی فـــەرد قافڵـــەش بەنـــدەن[1]

ماجـــــەرای ئـــــاخر یەومولمەماتـــــەن
ئومێـــــد بـــــڕیای قـــــەتع حەیاتـــــەن

«ئەحمـــەد» ســـەر تـــا پـــاش ئـــالوودەی دەردەن
یـــا ئـــاخر وشـــکاو ســـەر چەشمـــەی فـــەردەن

---

١- لە ڕۆژنامەدا نەبوو.

## قیبلەم و زووخاڵ

قیبلـــــەم و زۆخـــــاڵ قیبلـــــەم و زۆخـــــاڵ
ســـا مـــن جـــە دووریـــت نـــەبیم و زۆخـــاڵ

ســـــفتەم وە هـــــەردان نەبـــەردش شـــــەماڵ
ژیـــام، نەمـــەردم، هـــەر مەنـــدم وەی حـــاڵ

تـــــەمامی ئـــــەعزام نـــــەبی وە نـــــەی کـــــۆ
زەلان نـــــــاوەردش، گـــــــــەردم وەلای تــــــۆ

هـــەنی چـــێش واچـــوو، چـــێش پەنـــەم ئامـــان
خەجاڵـــــەت بـــــارم تـــــا مـــــەرگ ســـــامان

ئـــەر وەفـــام مـــەبی، شـــای زوڵـــف عەنبـــەر بـــۆ
مـــەویا هـــەر ئـــەو رۆ دوور کـــەوتم جـــە تـــۆ

دەرســـــات گیانەکـــــەم تەســـــلیم بکـــــەردا

تـــۆ پـــەی مـــەوتێ مـــن غوســســـەت بـــووەردا

ئیســــــە دووریـــــــت دیم ژیـــــام نەمـــــەردم

قـــــەدەم وەمـــــاوای عـــــەدەم نەبـــــەردم

چـــــەنی بواچـــــوو داروو وەفـــــای تـــــۆ

وێم چـــەنی وەفـــام خـــاکم بـــە ســـەر بـــۆ

«ئەحمـــــەد» تـــا ئـــەورۆ مـــاواش مـــەزارەن

جـــە ژیـــان وێـــش خەجاڵـــەت بـــارەن

## قیبله‌م باسشه‌ن

قیبلـــــه‌م باسشـــــه‌ن، قیبلـــــه‌م باسشـــــه‌ن

دڵ دایم جـــــه‌باس دووریـــــت باسشـــــه‌ن

گـــا فکـــر و گـــا ویـــر، گـــا وه‌سواسه‌شـــه‌ن

گـــا بـــێهـــوش،گـــاهۆش، گاگـــا تاسه‌شـــه‌ن

هـــه‌رکۆ هـــه‌ن هـــه‌رباس شـــه‌یدایی منـــه‌ن

بـــــاس بـــــه‌دبختی و رســـــوایی منـــــه‌ن

بـــاس بـــه‌دنـــامیم جـــه شـــاران باســـه‌ن

جـــه‌ی باســـان ئـــه‌روام جه‌تـــه‌ن هه‌راســـه‌ن

وه ســـه‌رگه‌ردت بـــام هـــه‌ی ئـــاوات واســـم

بـــۆ وه‌یـــه‌ک خـــه‌ده‌نگ کۆتـــا که‌رباســـم

هــەم ئــەروام نــە جــەور دووریــت خــەلاس بــۆ

هـــەم ســـاکنی دڵ هـــەم کۆتـــای بـــاس بـــۆ

وەرنـــە تـــا زێنـــدەن «ئەحمـــەد» هەراســـەن

بـــاس هـــەر بـــاس تـــۆن هـــەنێچ باســـەن

## وەهار ئاخێز کەرد

وەهـــار ئـــاخێز کـــەرد، وەهـــار ئـــاخێز کـــەرد

ســـپای نـــەو وەهـــار وەخـــەیر ئـــاخێز کـــەرد

وەفـــراوان شـــەتاو، هـــەردان لەبـــڕێز کـــەرد

ســـەوزەی دەشـــتو دەر قـــەناوێزبێز کـــەرد

قـــەتاران، جـــۆق جـــۆق، باخانـــان بارکـــەرد

تەشـــــریف و پایـــــەی ئێلاخـــــان ئـــــاوەرد

فـــەرش خـــەزرایی وســـت نـــەرووی بێســـات

نشت و بانێ تەخت دەست کـەرد وە حوکمـات

فـــەرما جاڕچیـــان چـــون هـــەردە ســـالان

خەبـــــەردار کـــــەردەن ســـــپای گـــــۆلالان

بەتـــــــەعجیل و دەو حـــــــاکم فـــــــەرمان‌دا
ڕووو کـــــەردەن وەکـــــۆ، جـــــاڕدان وە ســـــەحرا

واتـــــەن مزگـــــانی، دیســـــان شـــــای وەهـــــار
خەیمـــــــە وخیـــــــاوان هـــــــۆردان نەکۆســـــــار

تیـــــپ ئـــــارایی بـــــەزم عـــــەزم جەزمشـــــەن
چـــــەنی ســـــپای تـــــەم دەعـــــواو ڕەزمشـــــەن

گـــــوڵان ئیدئـــــەژنین نـــــەتۆی پـــــەردەی خـــــار
جـــۆق جـــۆق و تیـــپ تیـــپ چـــون تیـــپ خونکـــار

خەیمـــــــە وخیـــــــاوان هـــــــۆردان نەســـــــارا
بەســـــەد هـــــەزار ڕەنـــــگ چـــــۆن ســـــپای دارا

شـــای وەهـــار چـــۆن دیـــش ســـپاش بی‌زیـــاد
بـــــەنای رەزم جـــــەنگ ئـــــاوردەش و یـــــاد

دانـــــە تیـــــپ کـــــۆس چـــــون ســـــپای یەمـــــەن
ئـــاخێز کـــەرد وەجـــەنگ پـــەی دەفـــع دۆشمـــەن

پــــەنا بــــەرد وەزات بارگــــەی شــــای نەجــــەف
بنالّــــــــه نــــــــەفیر «اضــــــــرب لا تخــــــــف»
دانــــــه تیــــــپ تــــــەم بارخانــــــەی شــــــاهی
زەمــــین جــــۆش ئــــاوەرد تــــا گــــاوو مــــاهی
ســــــپای تیــــــپ تــــــەم شکەســــــت ئــــــاوردن
جەدەســــتێ دۆشمــــەن نــــیم گیانــــێ بــــەردەن
بەفــــــەتح فــــــەتتاح فــــــەتحنامــــــەش وەنــــــد
فــــــەرما ســــــەرداران رووکــــــەن وەئەلّــــــوەند
کلّــــــــیلاّن نــــــــەرووی کــــــــوان بــــــــەردەوە
بــــۆی عــــەتر و عــــەبیر هــــەرزان کــــەردەوە
جــــەودەم شــــای وەهــــار بەوێنــــەی شــــاهان
تەلّــــەب کــــەرد یەکســــەر ســــان ســــپاهان
خــــەلاّت پەخشــــان کــــەرد ســــەد هــــەزار وێنــــە
کــــــۆل پارچــــــەی قــــــەدیم کــــــار خەزێنــــــە

کـــــالاَی ئـــــەخزەری بەخشاوەئەشـــــجار

بی‌وە زینـــەتبـــەخش پـــەی ســـپای وەهـــار

جـــەودەم گـــولالان تەلـــەب کـــەرد یەکســـەر

ســـاندا سپاشـــان چـــون ســـپای قەیســـەر

ئەحمـــــەری و بەنـــــەفش، زیـــــرەتی وقیلـــــی

چێرەیـــــــی و زەرد،عـــــــەننابی و نیلـــــــی

گـــولْگـــەزی و گـــولْنـــار رەنگـــێ نـــەباتی

تـــــوول تـــــوول ورارا، تـــــەرح گۆجـــــەراتی

ســـــفیدی و ســـــفید ئەبیـــــەزی و زەنگـــــی

ئەســـــــــوەدی و زیـــــــــری کارفـــــــــەرەنگی

عەرووســـان دەســـتوور جـــە ســـەد هـــەزار ڕەنـــگ

خـــەلات پەخشـــان کـــەرد جـــەدیبای فـــەرەنگ

هەریـــــەک ولێبـــــاس کارخانـــــەی شـــــایی

پۆشـــــان وەبـــــەدەن پـــــەی خودنـــــەمایی

تیـــپ تیـــپ پـــی دەســـتوور جەلانســـاران

چـــون تـــەواف چیـــان وەیـــس نـــازاران

گاهـــێ نـــەقیام گـــا نـــە ســـجوودەن

گـــا نـــە شـــوکرانەی فـــەردی وەدوودەن

فەســـڵ کەســـێوەن جـــە خـــەم بـــۆ بێـــزار

بێـــدار بۆجـــە شـــەوق کارخانـــەی وەهـــار

کەمـــەر بوینـــۆ هـــەر ســـۆب تاوەشـــام

بـــێ خـــەوف بگێڵـــۆ مـــەقام بـــە مـــەقام

بـــێ دەســـتوور چـــەنی هامســـەران وێـــش

بکـــەرۆ ســـەیران بـــێ خـــەوف و ئەنـــدێش

گـــا کـــەرۆ وەزەیـــد ســـایەی وەرکـــاوان

گـــۆش دەرۆ وەدەنـــگ ناڵـــەی شـــەتاوان

گـــا مەســـت مـــەدهۆش، عاشـــقانەوار

بکـــەرۆ ســـەیران دیـــارو وەدیـــار

پـــەی کەســـێ وەشـــەن ئـــەی وەهـــارێ نـــۆ

خـــــەمی کۆنـــــەو نـــــۆ وەبـــــاد بـــــدەرۆ

یـــە «ئەحمـــەد» واتـــەن هێجـــرانی بـــارەن

بێـــــزار جەســـــەیران گەشـــــتی وەهـــــارەن

***

## خەلقان هەراسان بێ قەراریمەن

خـــــەلقان هەراســـــان بـــــێ قەراریمـــــەن
هـــەر شـــەو تـــا بـــە ڕۆ شـــین و زاریمـــەن
چـــم نـــەجای ئەســـرین زۆخـــاو جـــێش مشـــۆ
کـــــافر وەجەســـــتەم بـــــەزئیش مـــــەیۆ
نـــێش مـــوژەی تـــۆم دڵ کـــەردەن پـــارە
وەدەواو دەرمـــــان نمـــــەبۆ چـــــارە
مەرقـــەترەی عـــەرەق پـــای بـــەیان زەرد
چـــەنی نۆختـــەی خـــاڵ، فـــیرۆزەی بـــێ گـــەرد
چـــەنی تـــای کـــەڵاف مۆشـــک عـــەتر ئـــامێز
خەیاتـــەی بـــێ خـــەوش گـــا ســـیاو، گـــا دێـــز
بکیانـــە پـــەرێم حـــووری زادەی حـــوور
پـــەرێ بەقیـــەی زام نەســـرفتەی ناســـۆر

دڵســـــــۆزان بــــــــەیان جەهۆزانـــــــەوە

جـــــای نـــــێش مــــۆژەت بدۆزانـــــەوە

نۆختـــــەی مـــــاوای خـــــاڵ عـــــەتر لیمـــــووان

مەرهەمـــــەن پـــــەی زام جەســـــتەی ناتـــــەوان

دڵ کـــــەرۆ خـــــەڵاس جـــــە ئـــــێش زامـــــت

وەرنـــــە هـــــەر بـــــە ســـــۆن تـــــا ڕۆی قیامـــــەت

## فەڵەک بار دەرد

فەڵـــــەک بـــــار دەرد، فەڵـــــەک بـــــار دەرد
تاکـــــەی بکێشـــــم ســـــزای بـــــاردەرد
وەهـــــار دا نـــــە تـــــەپڵ، زمســـــتان ویـــــەرد
تاکـــــەی جـــــەور دەرد ڕەنگـــــم کـــــەرۆ زەرد
مـــــەرپێت نـــــەیاوان دوود ئـــــاه مـــــن
هەناســـــان ســـــەرد ســـــەحەرگاه مـــــن
شـــــین شەوناڵـــــین نـــــامۆرادی مـــــن
گـــــرەی کـــــۆرێ دڵ دوورجـــــە شـــــادی مـــــن
کـــــزەی زۆخ خـــــەم نادیـــــاری مـــــن
قرچـــــەی ئوســـــتۆخان، دەرد کـــــاری مـــــن

مـــەر مـــن جەئومـــەت مۆســـتەفا ســـەوام
چـــۆن ســـکەی خـــارج قەڵـــبی نـــاڕەوام

مـــن پـــەیکۆڵ نـــەڕای رەســـووڵ نەشـــەندم
نـــەدانم پـــەی ئـــادەم، گـــەواهی گەنـــدم

کـــــارێ نامشـــــروع نامـــــا جەدەســـــتم
پـــەی قـــەتڵ قـــاتڵ کەمـــەر نەبەســـتم

کوففـــــارێ کـــــافر نەکێشـــــام نەشـــــار
زەکـــەریام نەکۆشـــت بەمـــەودای مشـــار

نەکـــــەردم کـــــۆفران مائیـــــدەی عیســـــا
خـــەتاکار نـــــەبیم وێنـــــەی «برلـــــیلا»

بـــار نـــەفت و نـــار نـــەمروود نەپاشـــام
مەنجـــەنیق پـــەی مـــەرگ خـــەلیل نەتاشـــام

ناقـــەی ساڵـــحم وەســـەرقەت نەبـــەرد
میناکـــاری تـــەخت فێرعـــەونم نەکـــەرد

تـــیرم رشــــتەی هـــوون نامـــا نـــە دامـــان
فـــــۆراتم نەبەســــت نـــــەڕوی ئێمامـــــان
چـــەنی قـــەومێ لـــووت مـــەی نۆشـــیم نەکـــەرد
پـــەی قەتڵـــێ حۆســـەین سەرگوشـــیم نەکـــەرد
ڕای کەعبـــەم نـــەگێرت نـــەڕووی حاجیـــان
تێـــغ نـــەدام نەفـــەرق فرقـــەی حاجیـــان
راگـــــەی عەتـــــەبات نەکـــــەردەنم بەنـــــد
بـــــاجم نــــــەعازم ڕای نەجـــــەف نەســــەند
فەڵـــەک مـــن پەیـــڕەو دینـــێ نـــەبی بـــیم
چەنـد سـاڵ نەپـەی دیـن مـن مەکتـەبی بـیم
بـێ راز وبـێ عـەیب، بـێ کـۆفر و کـین بـیم
حـــــەقیر مەزڵـــــووم ڕووی ســـــەرزەمین بـــــیم
حـەق وێـش گەواهـەن نمـەک شـناس بـیم
حـــــەکاکێ پرکـــــار خەواســـــێ خـــــاس بـــــیم

ئـــــەر ســــــزاوارم عێتــــابم تــــا کــــەی؟
ئـــــەر موسوڵـــمانم، عــــەزابم تــــا کــــەی؟

بـــا ڕەحمــــەت بـــەیۆ وەجەســـــتەو حاڵـــم
ناڵـــــەم جێـــت ویـــــەرد تــــا کـــەی بناڵـــم

بـــە حاجـــەتی نـــوور شـــای «خیرالبشـــر»
ببەخشـــــەم بـــــە نوورشــــــەفێع مەحشـــــەر

هەرچەنـــد مـــن عاســـی مەعســـیەت بـــارم
بــــــــەلۆتف یــــــــەکتا ئومێــــــــــدوارم

خـــالق، تـــۆ قـــادر بەنـــدەی عەبـــدێ تـــۆم
نەدەرگانــــەی تــــۆ هەرئێــــدەن ئــــەرجۆم

نـــە جۆرمـــێ «ئەحمـــەد» بوویـــەرە قـــادر
هەرچەنـــد گۆناهـــان لـــێش بیـــەن ســـادر

# تۆبەکارانەن

تۆبەکارانەن، تۆبەکارانەن
سۆزێ لاڵەی گەرم تۆبە کارانەن

کزەی جگەر سۆز هەردە جارانەن
یا نە، سفتەکەی بەین یارانەن

گا مەردەی بێهۆش، گا زێندەم بە سەر
گا وێڵی هەردان سەرعی دەربەدەر

گا لەب و خەندە، دەمێ زاریمەن
لادێ جە هێجران بێ قەراریمەن

نەگێجاو بەحر جەیحوونی تاسەم
شکەستەن کەشتی سەبای هەناسەم

ســــەوای ئامشـــۆی هەناســـــەم بەنــــدەن
مــــەمات بنچینــــەی حـــــەیاتم کەنــــدەن

وەرنـــە یـــەک نەفـــەس ســـەما و ســـەرزەمین
مەســـــۆزۆ بـــــە نـــــار دڵـــــەی ماتـــــەمین

فێـــدات بـــام قۆربـــان هـــەی بـــەر گۆزیـــدەم
دووریـــت کـــەم کـــەردەن بینـــایی دیـــدەم

وەلحاســـــــڵ دەردان تـــــەمامی یەکســــــەر
گشـــت وەنـــەم ســـەردان ســـەوڵ نـــاز پـــەروەر

مـــــەجنوونی ئاســـــا حـــــەیات و مـــــەمات
ئەنیســــی منــــەن گیــــانم بــــۆ فێــــدات

گـــــا وەیانـــــەی هـــــوون نەســـــەر کـــــڵاوان
وێــــڵ وێــــڵ مەگێڵــــوو پــــەرێت نــــەکاوان

گـــــا مەســــت مــــەدهۆش، مــــات خەیاڵــــم
گانـــــە فێکــــر وهــــۆش ڕاگــــەی وێساڵــــم

گـــا شـــاد و ســـەرخۆش گاهـــێ غـــەمناکم
گـا چـۆن نـەقش سـەنگ ئوفتـادەی خـاکم

گاهـــێ چـــۆڵ کـــۆ، فـــارغ نـــە ئـــەغیار
گـــا ئـــەنیس راز هـــەم دەردێ تـــەییار

گاپـــەی دڵ وەشـــی دڵـــەی بـــێ قـــەرار
مەکـــەروو رازان شـــەکەرین گۆفتـــار

هەرچەنـــد دڵ وەشـــی دڵـــە ســـا بســـرەو
فزونتـــەر مـــەبۆ گـــڕەی نـــار ئـــەو

خـــۆ لاســـەی کـــەلام لـــەیلی سۆســـەن خـــاڵ
ســـەرتاپای بـــەدەن هـــا بی وەزۆخـــاڵ

مەگـــەر حـــەق، مـــۆراد مـــن حاســـڵ کـــەرۆ
دیـــدەی دڵ دیـــدەی تـــۆ واســـڵ کـــەرۆ

وەرنـــە هـــا، وەختـــەن «ئەحمـــەد» چـــون یـــاران
داخـــڵ بـــۆ نەجـــەمع جەرگـــەی مـــەزاران

## ویساڵم پەی تۆ

ویساڵــم پــەی تــۆ، ویساڵــم پــەی تــۆ

ئــارەزووم بیــەن ویساڵــم پــەی تــۆ

جــە هێجــرت چــۆن نــەی مەناڵــم پــەی تــۆ

قۆربــان! کــەس نــەبۆ وەحاڵــم پــەی تــۆ

ســەرتاپا ســفتەی زۆخاڵــم پــەی تــۆ

هــیچ کــافر نــەبۆ وەحاڵــم پــەی تــۆ

دیــدەم پــەر ئەســرین بــێ نــوورەن پــەی تــۆ

بانــەی ئەرواکــەم خــاپوورەن پــەی تــۆ

ســتارەی مــەحبووس دەیجــوورەن پــەی تــۆ

بــێ کــەیفیم نەکــەیف مەســروورەن پــەی تــۆ

نــەحوجرەی خەمــدا مەلاڵــم پــەی تــۆ

هــیچ کــافر نــەبۆ وەحاڵــم پــەی تــۆ

ئەبـــداڵ کۆگـــەرد مـــەجنوونم پـــەی تـــۆ

دێوانـــەی دەیـــری مـــەحزوونم پـــەی تـــۆ

جـــە غایـــەت بـــەدەر زەبـــوونم پـــەی تـــۆ

وەنـــیم نێگایـــێ مـــەمنوونم پـــەی تـــۆ

شکەســـتەن هـــەم ســـاق، هـــەم باڵـــم پـــەی تـــۆ

هـــیچ کـــافر نـــەبۆ وەحاڵـــم پـــەی تـــۆ

ئـــازیز، لاڵ بیـــەن زبـــانم پـــەی تـــۆ

چـــون قەقنـــەس دەروون بریـــانم پـــەی تـــۆ

قـــەد دالی داخـــی،کـــەمانم پـــەی تـــۆ

بـــەدەن بێـــزارەن جـــەگیانم پـــەی تـــۆ

نیـــەن جـــای مـــەلجا، مەجاڵـــم پـــەی تـــۆ

هـــیچ کـــافر نـــەبۆ وە حاڵـــم پـــەی تـــۆ

شـــیرین، مـــن مـــەجرۆح ئـــەوگارم پـــەی تـــۆ

فـــەرهاد کۆکـــەن زامـــدارم پـــەی تـــۆ

بـێ کـەس، بـێ هامـدەنگ، بـێیـارم پـەی تـۆ

مـــن دڵســـۆزی زار، غـــەمخـــوارم پـــەی تـــۆ

بۆڵـــــەندەن ناڵـــــەم زۆڵاڵـــــم پـــــەی تـــــۆ

هـــیچ کـــافر نـــەبۆ وەحاڵـــم پـــەی تـــۆ

لـــەیلی مـــن! دەروون پـــڕ مـــەیلم پـــەی تـــۆ

قـــەیس قـــەتران بـــەرگ دۆجـــەیلم پـــەی تـــۆ

وەکـــۆی نەجـــدەوە ئەبداڵـــم پـــەی تـــۆ

هـــیچ کـــافر نـــەبۆ وەحاڵـــم پـــەی تـــۆ

گـــەدای گـــۆر غـــەریب شـــارانم پـــەی تـــۆ

ئـــاوارەی وەتـــەن یـــارانم پـــەی تـــۆ

وەحـــش ئەفســـۆردەی غـــارانم پـــەی تـــۆ

پـــا، پـــەڕ ئـــێش نـــێش خـــارانم پـــەی تـــۆ

## دوو ساخ حەڵقەی زنجیرم پەی تۆ

بە داخەوە لێرەدا پێنج بەیت بە ئاو شۆرابوو و نەخوێندرایەوە

دوو ســـــاخ حەڵـــقەی زنجـــیرم پـــەی تـــۆ
پـــا نـــە پاڵـــەهەنگ ئەســـیرم پـــەی تـــۆ

بەنـــــدیان ئاســـــا زویـــــرم پـــــەی تـــــۆ
بەنـــدەن ڕای نـــەجات تـــەدبیرم پـــەی تـــۆ

غـــەریبم تـــەن کـــۆی زۆخاڵـــم پـــەی تـــۆ
هـــیچ کـــافر نـــەبۆ وەحاڵـــم پـــەی تـــۆ

## جەفای تۆم وەردەن

جــــەفای تــــۆم وەردەن، جــــەفای تــــۆم وەردەن
ئــاریز مــن یەنــد جــەور جــەفای تــۆم وەردەن
نەعشــــم هانــــە حــــاڵ غەرِغــــەرِەی مــــەردەن
هــا، یــاوا وەعــدەی گیــان تەســلیم کــەردەن
ئینــــە گــــرد جــــە داخ جــــەور جــــەفای تــــۆ
هــیچ نــەدیم و چــەم ســاتێ ســەفای تــۆ
بــــەو خــــوا قەســــەم واحــــد فــــەردەن
حــس تــۆش وەی تــەور و جــوور ئــاوەردەن
کــــزە و قرچــــەی جــــەرگ بــــۆی کــــەواو دڵ
گرپــەی گــرِەی نــار دەروون پــر چــڵ
ئــــەو کــــزش کــــەردەن خــــەلایق ئەســــەم
ئێــدێ ســارای وێســاڵ پۆشــنان وەتــەم

خـــــەوفم هەرئیــــدەن مـــــن جەمــــەردەنم

بـــــە وەقـــــت تەســــلیم گیــــان ســــپەردەنم

بـــــــەیانم وەســــــەر نــــــەکیر و مۆنکـــــــەر

بواچــــــان کێتــــــەن. خــــــۆدا و پێغەمبــــــەر

چـــــێش بـــــدەو جـــــواب، ئـــــەوکۆ بـــــەروو داد

نــــــەو ســــــەروەختەدا، هــــــەرتۆم هاوەیــــــاد

ئــــازیز! یــــە ســــزای ئێســــتێغنای وەسڵــــت

یەجــــەور غۆربــــەت یــــە جــــەفای فەسڵــــت

یــــــەدوود ســــــینەی تــــــەوەن تاومــــــەن

یەدیــــدەی پــــەڕنم شــــەۆ بــــێ خاومــــەن

خــــۆ نــــەویت رازی بــــە وەســــڵ یــــاران

پــــێم ئــــاورد دەردی غــــەریبی شــــاران

بــــارێ جــــەی غۆربــــەت نەکــــەردات وەیــــاد

ئێســــە، خــــۆ هــــا، وەڵــــگ عــــۆمرم شــــی وەبــــاد

## سەردار سپای بێ وەفا و مەیلان

سەردار سپای بێ وەفا و مەیلان!
سالار گرۆی دڵ جەقین کەیلان
پەی چێش، پەی رەقیب جەمن و یەردی؟
تەرک دووستی سەدساڵە کەردی
ناوەردت وەچەم جەفای سەد ساڵەم
نەکەردت وەیاد دەورەکەی تاڵەم
من کێشام جەفای بێ سامان تۆ
ئەو پێکا پەنجە وەدامان تۆ
من وێنەی بۆڵبۆڵ نالام و دەم دەرد
ئەو چۆن باغەبان خۆنچەی وەسڵت بەرد
من خار دووریم وەدیدە بەردەن
ئەو تەماشای گوڵ جەماڵت کەردەن

مـــن بـــیم وه مـــەجنوون بیـــدی لۆنـــگ وەکـــوڵ

ئـــــەو بی نـــــەردەگای لوتـــــف تـــــۆ مـــــەقبووڵ

مـــــــن فەرهادئاســــــا کۆکـــــــەنیم کـــــــەردەن

ئـــــەو بـــــادەی نێگـــــای شـــــیرینت وەردەن

مـــــن بـــــیم ئـــــاوارەی کـــــۆی عێشـــــوەو نـــــازت

ئـــــــــەو بی وه مـــــــــــەحرەم راز و نیـــــــــــازت

مـــــن بـــــێ بـــــەهره بـــــیم جـــــەنیگای خاڵـــــت

ئـــــەو بی وەهـــــام فـــــەرد بـــــەزم جەماڵـــــت

مـــــن وێم وەســـــەنعان تـــــۆم وه تەرســـــا کـــــەرد

کفـــــــر و مۆبـــــــەتم و مـــــــــەجلێس ئـــــــاوەرد

یەنـــــــد ســـــــزام کێشـــــــا پەنـــــــەش نـــــــەزانای

دەرســـــــــێ و مۆبـــــــــەت دڵـــــــــم نـــــــــەوانای

دەی‌تـــــــر مەحاڵـــــــەن دڵـــــــداریت کـــــــەروون

شـــــەرت بـــــۆ شـــــکایت وەلای حـــــەق بـــــەروون

بەڵـــــکم خوداوەنـــــد کــــەرۆ دیـــــوانم
چەنـــــەت بســـــانۆ ســـــزای زامـــــانم
بەڵـــــکم ئێنتێقـــــام بســـــانۆ چـــــەنیت
قـــــەزاو بـــــەڵای ســـــەخت بـــوارۆ پـــــەرێت
تـــۆیچ بـــە وێنـــەی مـــن گـــیرودە دام بی
مۆبتــــــەلای فێــــــراق دۆس ناکــــــام بی
ســــــەراپا هـــــونین دووری یــــــاران بی
نۆقتـــــــــەی دایـــــــــیرەی دەردەداران بی

مەولەوی ئەم غەزەلەی لە وەڵامی ئەحمەدبەگی کۆماسی وتـووە، گوایـە ئەحمەدبەگ بۆی نووسیوە یار ئێستە وەکوو لەمەوبەر نییە، گەلێ شۆخ و شەنگتر لە جارانە.

## پەشێو وێنەی وێم

پەشـــێو وێنـــەی وێم نیشـــتە بـــیم خـــەجڵ
دیم شـــــادی دەس دا نـــــە دەروازەی دڵ
واتم نامـــــانی هـــــەرگیزهای چێشـــــەن
لـــەب بـــەردەوە چـــێش نامـــەیی پێشـــەن
نـــە تـــاریکی خـــەت مـــەعناش مەجۆشـــا
چـــون ئاوحـــەیات دڵ خـــاس خـــاس نۆشـــا
ئـــاخ، قـــووەی زەمـــین دەروونم کـــەم بی
بووڵـــەکەی ســـفتەم ســـەرەڕای خـــەم بی
وەرنـــە ئـــەو شـــەونم جـــە ســـەردات مەوەشـــت
مەشـــیا کـــەردا ئـــێش وە ڕەوزەی بەهەشـــت

فـــەرمابێت ئیســـا جـــەمین جـــام جـــم

پاســـەیچە نیـیـــەن تودینـــت وەچـــەم

نـــــرخ کاڵاکـــــەش ئاڵاتـــــەر بیـیـــــەن

ســـەد گیـــان وەپووڵـــی باڵاتـــەر نیـیـــەن

ئـاریٚ تـا پـەی ئـەو مـن رۆمـەن چـون شـەو

شـەوقەن پـەی خەنـدەی سـوبح جەبهـەی ئـەۆ

تـــا وە ئـــەڕڕەی دەرد دڵـــەی مـــن شـــانەن

زەریـــفتـــەر تـــوڕڕەی ئـــەو دانـــە دانـــەن

تـا مـن دووی سـفتەی جەسـتەم فێشـتەرەن

جـــــەلای ئاوێنـــــەی ئـــــەو زیادتـــــەرەن

تـــا ســـفتەی قامـــەت مـــن وسمەوەشـــەن

ئـــەبرۆی ئـــەو، وە ڕووی دڵ کـــەمان کەشـــەن

هـای چێشـت واتـەن، وە ڕەحمـەت شـاد بی

مـــەر زووتـــەر کـــەم بی، ئیســـە زیـــاد بی؟

ئـــەر جـــەزام دڵ مـــن نیگـــات مەکـــەرد

مـــەزانات ئـــەو زات ئـــەو وەســـف بی‌گـــەرد

ئـــەوڕاز و ئـــەوباز، ئـــەو قـــەوس، ئـــەو خـــەدەنگ

بی‌یـــەن، هـــەن، مـــەبو، مـــەگێڵان جـــە ڕەنـــگ

حاڵـــــش دەســـــتەمل وە ئێستقباڵـــــەن

ئێســـتقباڵ چـــەنی مـــازیش یـــەک حاڵـــەن

بـــــاری دڵ وەخشـــــت وێـــــرانی ئـــــاوان

حـــــەقت وە دەســـــەن نـــــەداری تـــــاوان

دڵ طفـــــل و ئـــــاریز، هـــــەر ڕۆ نەشـــــانی

هـــــەر لادێ تـــــەرزێ، هەرســـــات نیشـــــانێ

گـــــاچون ســـــتارەی تاریکـــــەی ســـــەحەر

گـــا قەمـــەر، گـــا خـــور مـــەیۆ وەنـــەزەر

گـــــا وە بێســـــتون هەســـــتی‌ی بینـــــاوە

حوســـنش وەگـــوڵ گـــوون وەش ئیســـتیغناوە

دەســــــت شــــــیرینش مـــــاوەرۆ وە یـــــاد

فــــەرهادی نـــەتاق فەرقەکـــەی فـــەرهاد

گـــا چـــەرخ دیـــدەی ســـەد لـــەیلا فـــروش

کـــــوورەی نـــار نـــاز مـــــاوەرۆ وەجــــۆش

تـــا بـــۆی حـــەرارەت مـــەوج دەریـــای دەرد

مـــەجنوون وێنـــەی تـــەم بـــەرۆ هـــەردەو هـــەرد

خاڵــــۆ پـــەی جـــەلال ئـــەر کارسازیشـــەن

وادەی تەجـــــەللای تـــــیر ئەندازیشــــــەن

بســـم الله ئـــەو تـــیر پـــەڕ تێـــدا بەســـتەش

ئیـــد نیشـــانەی تـــەن ســـەدجار شکســـتەش

چـــون ڕەنـــگ کـــەرۆ زام تـــازە زامـــانم

ئـــاو مـــزۆ ئـــەو دەم کۆنـــە زامـــانم

زام تـــــەن وەتـــــیر بـــــەڵاش زیاتـــــەر

ڕای ئامۆشـــــــۆی دڵ وەلاش زیاتـــــــەر

مەولەوی ئـەم پارچـە شـیعرەی بـە بۆنـەی دوورکەوتنـەوەی ئەحمەدبـەگی کۆماسیەوە وتووە. کەوا دیارە دوور خرابێتەوە بۆ ناوچەی ڕەشتی گێلان.

## جەرگت لەت لەت بۆ

جەرگت لـەت لـەت بـۆ چەواشـەی چـەپ گـەرد
خاڵــــۆت جیاکـــــەرد، یـــــەکار بی تــــۆ کـــــەرد
دیـــــدە، وادەی ســـــەیل هۆنـــــەی هوونـــــاوەن
دڵـــــە، وەخـــــت بـــــەزم نۆشـــــای زووخـــــاوەن
وەش ڕەنگــــی بـــــازەم، ســـــا دەی بــــێ‌ڕەنگــــی
شـــــادی بـــــاوەس بــــۆ، وەختـــــەن دڵ تــــەنگی
وەشـــــی، وادەت شـــــی وەش ئامـــــای وەخــــەیر
شــــەوقە، وەتــــەوق بــــای تاکــــەی هــــەوای ســــەیر

مانیـــــای مەینــــەت ســــەرەو کــــۆی ســــتەم

مەعــــدوومی بـــەرکۆی ســـەرەو چێـــرەی خـــەم

چ وەختــــەن دڵــــەت جـــە شـــادی کەیلــــەن

دەک لێلاویــــت بــــۆ یـــە وەفـــا و مەیلــــەن

ئــــەو چــــەم بـــە ســـورمەی خـــەمناکی ڕەشـــتە

چەنی گەشت دەشـت پـای ڕەشـت سەرگەشـتە

هــــامڕاز ئـــاخ و داخ، ناڵــــە نـــەوای نـــەی

دڵ کەباب، چەم جام، خەم سـاقی، هـوون مـەی

تــو ئـالوودەی بـەزم جەرگـەی هـام فـەردان

کــەیف مــەی، ســوحبەت گــرۆیهــام دەردان

ئەوســـەبوون ســـفتەی پـــڕ داخ بـــێ پـــەرداخ

تـــۆ بـــۆی شـــنۆی بـــای ئـــێڵاخ نـــەدەماخ

ئـە وتەشـنەی ڕای چـۆڵ سـای گـەردن پڕگـەرد

تـــۆ ســـێراو نـــە پـــای وەفـــراوان ســـەرد

مـــلان، ســــەربەرزان، کوســـاران، هــــەردان

بــــێشــــەرتان، جــــەداخ وەفاتــــان مــــەردان

چێشــــەن ئــــارایش ســــەر تــــا وەدامــــان

مــــەر خاڵــــۆم وەعــــەزم ســــەیرتان ئامــــان

مەشــــنیە چــــین چــــین چنــــوور نــــەکاوان

تۆخــــوا ماتــــەم بــــە، هــــاژەی وەفــــراوان

چنــــوور نــــەکاوان ئــــەو نــــەبۆ پــــەی چــــێش

هــــاژەی وەفــــراوان ئــــەو نــــەبۆ پــــەی چــــێش

نەســــــیم وەس بویــــــەر وەکۆســــــاراندا

وەســــــەن شــــــانای وەڵــــــگ وەدیارانــــــدا

شــــنوی ئەوبــــەرزە ئــــەو نــــەبۆ پــــەی چــــێش

لــــەرزەی ســــەد تــــەرزە ئــــەو نــــەبۆ پــــەی چــــێش

وەســــــەدای ســــــەرووەش دڵ وەش مــــــەزاقان

هــــــەنێ نەلــــــەرزۆ کــــــەڵ ڕەم نــــــەتاقان

ســـەدای ماردومـــان ئـــەو نـــەبۆ پـــەی چـــێش

ســـەفای کـــەڵ ڕەمـــان ئـــەو نـــەبۆ پـــەی چـــێش

خـــاڵ خاســـان بی‌ئـــان هـــەربار وەلێـــو بـــان

هێلانـــــەی دڵان بـــــا هـــــەر پەشـــــێوبان

ئـــەو ئانەپـــەی دڵ ئـــەو نـــەبۆ پـــەی چـــێش

ئـــەو لانـــە پـــەی دڵ ئـــەو نـــەبۆ پـــەی چـــێش

دەخیـــل هـــەی دەخیـــل خاڵـــۆکەی گیـــانی

وێـــت نـــەی ســـەفەردا تـــەنها نـــەزانی

مـــەرگ تـــۆم هەرچەنـــد تەشـــریف بـــەردەنی

تـــەرک خەڵـــتەو خـــاک جەســـتەم کـــەردەنی

گیـــان، دوس گیـــانی، رەفیـــق ڕاتـــەن

ســـورمەی بینـــائیش تۆزەکـــەی پاتـــەن

هـــەی ڕۆ نـــەواچی خـــودا نەکـــەردە

خـــەم وەفـــا وبەینـــەت نـــەویرم بـــەردە

بــــادەی بــــێوادەی فــــەنام وەردە بــــۆ

شــەرت بــۆ، کــامین شــەرت، یــاران کــەردەبۆ

تــــا دڵ جەلــــەزەت دینــــت ناکــــام بــــۆ

ئــەو زەوقــە تــۆ دیــت وەنــەم حــەرام بــۆ

جەســـتەی خەســـتەی خارســـەودایی خـــەجڵ

بــا بــەس بــۆ، تاکــەی، ئــەی دڵ وەشــیی دڵ

چــەپ گــەرد بــێفرســەت شــانا مــۆرەی نــەرد

عــــومرێ بــــێئامــــا؛ ویــــەرد، گــــوزەر کــــەرد

زەحمەتــــەن خــــەلاس جــــە دووری وەردە

بــــە هوونــــاو بــــەیۆ عــــومر ویــــەردە

مەولەوی ئەم قەسیدەی لە وڵامی خاڵۆی کۆماسیدا نووسیوە، سکاڵای دەردی عەشقی بۆ مەولەوی کردبوو و تیایدا سۆزی دڵی خۆی دەربڕیوە و چارەی لێ ویستووە.

## نامەکەت پەی چێش؟

نامەکـــەت پـــەی چـــێش؟ پـــەرێ دەوای دەرد

یـــــاوا خـــــاس وانـــــام موتالەعـــــەم کـــــەرد

ئـــاخ، داخـــان نیشـــاط جـــەبێخ کەنـــدەوێم

ڕای تـــــەدبیر کـــــەس پـــــێ نەمەنـــــدەوێم

ســـــەرەتای زووخـــــاو نەجـــــەرگم ســـــەردان

بەیـــدێ پێمـــــەوە، یـــاران، هـــام فـــــەردان

هـــاوار یانـــێ هـــای خاڵـــۆم نەشـــنەفتەن

جـــە نـــۆ کۆســـێتـــەر خاســـتەرم کەفتـــەن

دیـــدە کـــەم ماچـــان بیوەفـــائیش کـــەرد

شـــەرت و عەهـــد بـــەین وەریـــن جـــەیاد بـــەرد

زیـــاد بی ســـەردیی پـــەی غـــەمکەیلـــەکـــەش

کـــەم بی گـــەرمی‌ی تـــاو کـــوورەی مەیلەکـــەش

هـــــــەوای دۆس نـــــــۆش وەدەروون ئـــــــاوەرد

ســـفتەکەی کۆنـــەش یـــەکجار جـــە ویربـــەرد

دیدەکـــەم تـــۆ مـــەیل خەســـتەت زەروور بـــێ

ئـــەی بی‌شـــەرتی‌یـــە فـــرە چێـــت دوور بـــێ

خـــەیلێ واتم خـــەیچ ئـــێش زامـــم مـــەرد

ئـــای کولناتـــەوە ئێنـــە چێشـــت کـــەرد

بـــــەزەییت نامـــــا بـــــەی زاریمـــــەدا

وەی ناڵـــــەی شـــــەوان بێـــــداریمـــــەدا

وەی دڵـــەی پـــڕ ئـــێش پـــڕ زووخاومـــەدا

وەی هەناســـەی گـــەرم تـــەوەن تاومـــەدا

مـــن دڵـــم وەتـــیر تـــۆ ئێشـــا، یـــا ئـــەو

مـــن جـــەفا و مەینـــەت تـــۆ کێشـــام، یـــا ئـــەو

مـــن وێم وەســـەرگەرد بـــاڵات کـــەرد، یـــا ئـــەو

مـــن وێم فیـــدای خـــاک پـــاڵات کـــەرد، یـــا ئـــەو

جــــە بەدبـــــەختی وێم وەنـــــەش وارۆســـــەنگ

زانـــام بـــێ‌مـــەیلی ئـــەمما نـــەک وەی ڕەنـــگ

مــــن هـــیچ بەرکـــــەنار، ئەحواڵـــم مــــەپرس

خۆقیامــــەت هـــــەن جـــــە خــــودا بتـــــەرس

خاڵـــــــــۆ دەرد دڵ بــــــــــێ‌نیهایەتـــــــەن

شــــــکایەت نی‌یـــــــەن، یەحیکایەتـــــــەن

ئـــــاوایی پـــــەی غـــــەیر وێـــــران ماڵـــــەوێم

عاڵـــــەم شـــــیرین کـــــام،مـــــەزاق تاڵـــــەوێم

نـــــاوەش پـــــێ‌حـــــەرام؛ وەش حەرامـــــە وێم

شـــادی پـــێ نوقســـان، غـــەم تەمامـــەوێم

هەڵـــــــــو زەدەکـــــــــەی ترســـــــــیاگە وێم

درۆ بــــــــۆ یــــــــا ڕاس هەوەســـــــــیاگەوێم

چ وەخـــت ئامـــای ئینشـــای فـــەردت بـــێ

چ وادەی داوای دەوای دەردت بـــــــــێ

گـــــلاراو مـــــەرگ چێگـــــە و چۆگەمـــــەن

دەخیـــــل تـــــەدبیرێ جـــارێ نۆگەمـــــەن

مەولەوی ئەم قەسیدەیەشی لە وڵامی قەسیدەیەکی ئەحمەدبەگی کۆماسیدا نووسیوە کە باسی شایی و زەماوەندێکی گەرمی تیا نووسیبوو بۆ مەولەوی. داخ و حەسرەتی پیشان دابوو کەوا مەولەوی لەو شایی‌یەدا نەبووە.

## نامەی نەفتینت

نامـــــەی نـــــەفتینت یـــــەک ڕۆ بـــــاد ئـــــاورد
کڵـــــپەی بڵێســــەی کـــــوورەم زیـــــاد کـــــەرد

دەلالـــــــەت جۆشــــــۆ چــــــۆن ڕۆی ئـــــازادی
گـــــەرمی گـــــەرم نـــــەزم بـــــەزم پـــــڕ شـــــادی

ســـــــەدای (لاو هـــــــەی لاو) زڕەی زەڕ زنجـــــیر
سڵسڵـــــە و بـــــانی‌ســـــەر بەنـــــدزری و لاگـــــیر

زیڵـــــەی گـــــوارە و زرنگـــــەی زەنگڵـــــەی زەڕ
لـــــەرزەی نـــــەو نـــــەمام، لـــــەرەی لیمـــــۆی تـــــەڕ

شـــــــەوق زەوق و بـــــــەرق فـــــــەرق زەڕکـــــــلاو
ورشـــــە و پرشـــــەی خـــــووی کوڵـــــم بـــــۆ گـــــوڵاو

شـەقە و تەقـەی گـەرم، چەپڵـە و چیلـەی نـەرم

چریکـــــەی وەنــــاز، تریکـــــەی وەشـــــەرم

ســـــەمای دەسمـــــاڵان، ڕەمـــــای نــــەوهاڵان

نــــەمای مــــەلالان، نمــــای وەش حــــاڵان

چفـەی گـەردەن کـەچ، مـەرگ مـن چـێش واچ

خــــاین وەخەفــــەت، نــــەزان جگــــەر پـــاچ

لارەی قـــــــــەتارەی لاو شـــــــــــەدەلاران

ئیشـــــارەی کــــەم کــــەم پەنجــــە وشــــاران

شـــاخەی شـــریخەی خشـــڵ نیمـــە ڕەنـــگ

فـڕەی فوتـەی شـۆڕ، پـاژنۆی گوڵـەنگ چـەنگ

خشە و خشپەی خاس، ترپەی پەنجـەی کـەوش

عیشـــوەو نەزاکـــەت، کریشـــمەی بـــێخـــەوش

وەلیمـــــۆی ئـــــاڵای کــــاڵای بــــاڵای شــــەنگ

قرچـە و چۆقـەی جـەرگ، دڵ وەخـەمان تـەنگ

خــــەمیا و چـــەمیای نـــاز نیمچـــە کناچـــان
دەنـــگ هـــەی شـــاباش نـــەوجوان واچـــان
شـــــاباش شـــــادیی شـــــەیدای شاباشـــــان
خاس خاس کـزەی سـۆز دەروون خـاش خاشـان
یـــــــاران، یـــــــاوەران، هـــــــای دەردەداران
بەیـــــدێ بکـــــەردێ مـــــن ســـــەنگەباران
جــە نەحســـیی تاڵـــە و جـــە بـــەد ئێقباڵـــیم
هـــــەرکۆ فرســـــەتەن مـــــن یاگـــــە خاڵـــــیم
ڕوو ئـــــەو شـــــیوەنان دەی ئەجـــــەل بـــــۆرێ
نـــەو بـــەزم شـــیرین مایـــەی هـــەر شـــۆرێ
تـــــا وەی ڕەنـــــگ زەرد چـــــۆن خەزانـــــەوە
ســـــیم ســـــاف هـــــەرس کـــــەس نەزانـــــەوە
هـــــەر لایـــــێ بـــــادەی شـــــەوقێوەم وەردا
یەکســـەر ســـەر چـــون گیـــان شاباشـــم کـــەردا

خاڵـــــۆ گیـــــان نامــــان پـــــەی نەونـــــەمامان

گیـــان دان وە مۆبـــەت، پـــەی مەعـــدووم ئامـــان

مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بۆ خاڵۆی کۆماسی ناردووە.

## هەرچەنی ناکاو دماخم تەم بی

هەرچـــــەنی ناکـــــاو دمـــــاخم تـــــەم بی
ســـــیاهەور دوود نەکەللـــــــەم جــــــەم بی

بـــــەرق و برووســـــکە و تـــــەم داش وەهـــــەمدا
پلووســـــکەی ســـــێڵاو ئامـــــام وەچـــــەمدا

خاشـــــاک هەســـــتیم لافـــــاو بـــــەردەوە
دەروون پـــــــێچش داو دڵ ویـــــــەردەوە

زانـــــام هـــــەم دیســـــان دڵ کـــــۆس نۆشـــــەن
گەردەلوولشـــــــەن ئـــــــارەزووی تۆشـــــــەن

جۆشـــــش وەردەبـــــێ چـــــار وێم نەکـــــەرد
وە هـــــەرحاڵ نـــــە بـــــەین شـــــەرتێمان ویـــــەرد

نـــــەک چـــــەنی خـــــەیاڵ قیبلـــــەم بســـــازی
دەخیـــــل تـــــەن خەســـــتەن وەجیـــــاش نـــــازی

سـەرهەردەو سـەرهەرد، مـەنزڵ ئـەو مـەنزڵ
دڵ ئـــەو شـــۆن تـــۆ، مـــن ئـــەو شـــۆن دڵ

دیم بەدعەهــدیش کــەرد هــەوا ســەندەوە
تــەن حەســـرەتمەند بی جیـــا مەنـــدەوە

جــە بــێشــەرتی دڵ زامــەتم ســەختەن
وێـــت یاونـــەوە هـــا نەســـیم وختـــەن

ڕەحمــێ کــەر وەحــاڵ خــەمان هــەرزاندا
تەشـــریف بـــەر بدیـــە وەســـەر بـــەرزاندا

هــەر جایــێ چــۆن بــەخت دوور نــەوهاڵان
ســـیا بـــۆ تاریـــک جـــە ســـیاماڵان

گــێج دوود ئــاخ هــەواش پــەڕ کــەردەن
ئانـــە یاتاخگـــەی خاڵـــۆی هـــام فـــەردەن

گـــاگێج سەرســـام نـــە گـــەرداوەدا
گـــا خەفتـــەن نـــە تـــۆی خەفـــەت خـــاوەدا

جە نەشـئەی گـەرمیی هـەوای کـوورەی مـەیل

جای تینـیش کـەم کـەم جـە نم بیـیەن کـەیل

وێــت ئاســا وەنــەرم وێــت نــە ڕووی نم دەر

بــەو شــنۆی فێنــک دڵــش بێــدار کــەر

بـەڵام شـنیای تـای سـەر سـورمەی بـێگـەرد

ئـازار نــەدۆ هــیچ دەســای گــەردەن زەرد

مەپەرســـۆ ســـێڵاو ئەســـرینان تاوتـــاو

بـــــڕێز وەڕوودا، ئێــــدش دەر جــــــواو

ســـفتەکەی سەرســـام تـــەن ناتـــەوانا

دیم خەســتەن کەفتــەن هــەر ئێــد موانــا

یــە ســەختیی زامــەت، یــە دەرد موشــکوڵ

یــە دووریی خاڵــۆم، یــە بــێشــەرتیی دڵ

ئەجــەل نــیم ڕەمــەق بــاقیـیــەن ســادەی

جــەو دمــا بــەختان مــەوینانت پــەی

خوالێخۆشبوو مەولەویی لە ئەحمدبەگی کۆماسی گلەیی ئەکا و ئەڵێ:

## خاڵۆ! چۆن تەدبیر دەرد زانات نەوی

خاڵـــۆ! چـــۆن تـــەدبیر دەرد زانـــات نـــەوی
هانـــام کـــەرد ئـــەوتۆ تـــەوانات نـــەوی

نـــــەتاوات وێـــــت دەی وە مـــــەودای وەیدا
گـــێج بـــدەی نـــەگێج دەریـــای بـــێپـــەیدا

هـــا، خـــودام وەحـــەق شـــادەتم ئـــاوەرد
خاڵـــۆم! مـــەوج گـــێج دەریـــا هـــورش کـــەرد

جـــە کـــەنارەوە ســـەعی کـــەردەت بـــۆ
هـــەوڵ پـــەلوو پـــووش ئـــاو ئـــاوەردەت بـــۆ

پەی چێش؟ خاڵۆکەی دەروون جە هوون کـەیل[1]
خـەیلێن ئـەجزای تـەن لەیلەکـەی پـڕ مـەیل

ئامێتـــەن وەجـــۆزو ڕێـــزەی مـــەجنووندا
حەیفـــەن ئـــادێ بـــەرۆش وەتوونـــای تـــووندا[2]

١- ڕۆژنامەی کوردستان ژمارەی ٧٤، لاپەری ٧.
٢- رۆژنامەی کوردستان ژمارەی ٧٤، لاپەرەی ٧.

## ئەحمەد بێگ بۆ مەعدوومی تایجۆزی

ئــــــەر بــــــۆ پــــــرووزەی وەمەلالــــــەوە
یــــــاوا وەلای تــــــۆ[1] جــــــە شەماڵــــــەوە
ئانــــە بــــۆ پــــرووز، ســــۆتەی جەرگمــــەن
مەعلوومــــەن[2] مەعــــدووم وادەی مەرگمــــەن
جــــە نامــــای جــــواو جــــەبێ وەفــــائیم
هــــەرچێت فــــەرماوان راســــتەن بینــــائیم[3]

١- «وەشەماڵەوە» رۆژنامەی کوردستان ژرمارەی ٧٣، لاپەرەی ١٠.
٢- « مەعلووم بۆ» رۆژنامەی کوردستان ژمارەی ٧٣، لاپەرەی ١٠.
٣- ئەم دێرە لە دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوەی موحەممەدی مـەلا عەبدولکـەریمی چـاپی بەغدا نیە و هی ڕۆژنامەی کوردستانە.

## مەعدووم لە جوابدا

ئـــارەزووی ئامـــای مـــەرگ وێـــت کـــەردەن

گوویـــــا خەلاســـــیت وە دڵ ئـــــاوەردەن

ئـــەی پـــەی وێـــت نـــەبۆ دۆســـەکەی گیـــانی

چەنـــدبۆ پـــرووز بـــۆ تـــۆ هـــەر بمـــانی١

١- «ئەم دوو دێڕە لە ڕۆژنامەی کوردستاندا ئاوا هاتووە»
گوویا خەلاسیت نەدڵ ئاوردەن/ئیزهارێ ئامای مەرگ وێت کەردەن
ئەی پەی وێت نەبۆ دۆسەکەی گیانی/سەد پڕووزیۆ تۆ هەر بمانی

## تێهەڵکێشی شیعرێکی مەولەوی لە لایەن ئەحمەد بەگەوە

فـــەردێ مەولـــەوی وەرەحمـــەت شـــاد بـــۆ
ئامـــــا وەیـــــادم رۆتبـــــەش زیـــــاد بـــــۆ

«مســـپارووت وەجـــۆش کـــزەی تاســـەی وێم
ودوود کــــــەواو بــــــۆی هەناســــــەی وێم»

نــــەواچی مــــەردەن، هانــــە ژێــــری گــــڵ
هێشــــتا مــــەیلی تــــۆم بەرنەشــــیەن جــــەدڵ

ئــــەورۆ جــــە ئەلحــــەد ســــەر مــــاروون وەبــــەر
جــــە بۆنــــەی تــــۆوە مشــــوون پــــەی مەحشــــەر

جەبۆنــــــەی تــــــووە جەننــــــەت مــــــەداپێم
وەرنــــــە چ کەســــــم؟، کــــــێ مزانــــــۆ کــــــێم

زێنــــــهار تــــــۆ کــــــەلام ڕات نەکــــــەری کــــــەم
رۆحــــــــــی ڕەوانم مــــــــــداروووت وە چــــــــــەم

## ئازیز نەزانام

ئـــازیز نـــەزانام، یـــە خـــەدێو خۆتـــەن

یەشـــەرت و یەشـــۆن یـــەتان و پۆتـــەن

یـــە دۆســـی، یـــە مـــەیل، یەدڵـــداریتەن

یەقـــەوڵ، یـــە ئێقـــرار وەفاداریتـــەن

بـــە وەڵـــڵا بـــیللا ســـەوگەند وەردەتـــەن

یەعدهـــدوو پـــەیمان خـــەلاف کەردەتـــەن

مـــن پاســـەم زانـــا پەڕشـــەرت ووشـــۆنی

نـــەزانام بـــێ مـــەیل بـــێتـــان و پـــۆنی

جـــە بۆڵـــبۆڵ بێـــزار، خـــار نـــەوازەنی

یـــار چـــەنی ئـــەغیار، بـــێ مـــەجازەنی

ئەگـــەر مزانـــام ئینـــە وەفاتـــەن

ئینـــە ســـزای ســـەخت جـــەور و جەفاتـــەن

ئینـــــه شـــەرتوو عەهـــد، بـــەین وبەقاتـــەن

ئینـــــە خـــۆ ئـــەتوار ئامـــاو لواتـــەن

هــەر بــەو بــێ شــەرتی دەی کــەردت قەســەم

.............................................

دڵ مـــــەدام و ئـــێش مـــەودای نیشــــتەردا

تێـــــرێ مـــــەوردم وەتـــــۆی جگـــــەردا

نــــەدڵ مـــــەدام پێـــت پـــەرێ دڵـــداری

نـــە جگـــەر مـــەدام پـــەی زام کـــاری

نەوڵــــــڵا و بــــــیللا چــــــەنیت مـــــەوردم

نەعەهـــــدو پــــەیمان بــــە جامـــــاوردەم

تـــــــۆ وەدڵ مایـــــــــل .... و ئێشــــــەن

... مۆبـــــەت دوســـــتی تـــــۆ چێشـــــەن

........................ نەونـــــــەمامی نـــــۆ

................... یـــەبێ شـــــەرتی تــــۆ

یەخەنـــدەی ڕەقیـــب یـــە شـــادی فێـــراق
یەســـــــۆز دەروون ناڵـــــــەی ئێشـــــــتیاق

یـــە جـــۆش خـــاتر، یـــە ئەســـرین چـــەم
یـــەبێ قـــەراری دڵـــەی پـــەڕ جەخـــەم

یـــەزەردی رۆخســـار، یەخـــەم یەقامـــەت
یـــە نـــێش دووری یـــە ئـــێش زامـــەت

ئـــەی چ خـــاس کـــەردەن جـــەڕووی وەفاومـــەیل
ئـــەدای ئێنشـــای فـــەرد مەعـــدوومی دڵ کـــەیل

«بـــێ تـــۆ ئـــاریزم قـــەرارم چوونـــەن
تـــەوەن نیـــەنان، دڵ گۆشـــت و هوونـــەن

ئێنســـافەن دووری زەخـــم بـــێ ســـامان
چێنـــــە زیاتـــــەر کافیـــــەن ئامـــــان»

غۆربەتەکـــەی چـــەم فـــرە یـــا کـــەم بـــۆ
تـــۆ خـــۆا بـــا ســـاتێ دڵ و بـــێ خـــەم بـــۆ

بەزمەکـــەی خـــەمان وەسڵـــت نـــە ویـــرەن

یـــا ناڵـــەی پەڕتـــەم جـــەلات دڵـــگیرەن

................ پـــــــەرێ ناڵەشـــــــەن

.................. هـــــەزارساڵـــــە شـــــەن

...... گۆشـــــەی چـــــەم نێگـــا داری کـــــەر

.................. وەفـــــــــــاداری کـــــــــــەر

ئـــی ئێســـتێغنا و قـــین زیـــادەن پـــەی چـــێش

رەقیـــب ومـــەیلت دڵشـــادەن پـــەی چـــێش

ئـــەرماچی خەســـتەی مەینـــەتان بـــەردە

تکـــــەی زۆخ جـــــەرگ زامـــــەتان وەردە

بـــادەی فـــەنای مـــەیل دووریـــش نـــۆش کـــەردەن

ئـــاریزێ چـــۆن مـــن فـــەرامۆش کـــەردەن

......... دووریـــــــت مەکێشـــــــوون .......

ئەســـرین دیـــدەم نـــوور ئەفشـــان کـــەردەن

تیرەکـــەت مەرهـــەم شـــەفای دەردمـــەن

دەردەکـــەت دەرمـــان ئـــاهی ســـەردمەن

دووریـــت راحـــەتی، هێجـــرەت شـــادیمەن

فێراقـــــت مایـــــەی دڵ ئازادیمـــــەن

وەسڵـــت خـــۆ سەرمەشـــق زێندگانیمـــەن

حوســـنت شـــەرح شـــەوق کامەرانیمـــەن

بـــــەڵام ئـــــازیزم چینـــــەی زیاتـــــەر

مـــــەتاوو گرتـــــەی ڕای دووری نـــــەوەر

### وله

تەســــکین دڵــــەی پەڕجــــە خارەکــــەم

دەرمــــان دەروون بــــێ قەرارەکــــــەم

نامــــەت کیاســــت وەلای مــــن یـــاوا

پـــەیا پـــەی نـــەڕۆی دوودیـــدەم ســـاوا

دەروونــــت و کــــۆڵ جــــۆش ئاوردەبـــێ

کــــزەی دووری وێــــت ئێزهــــار کــــەردەبێ

دێوناتــــــەوە دەرد کــــــــوورەی دەروونم

کولناتـــــەوە زام دڵـــــــەی پـــــەڕهوونم

نمــــازی ســــاتێ ڕاحــــەت بــــوو پـــەی وێم

دەک بـــێبـــەڵا بی چـــێش مەکـــەری پـــێم

مــــن خــــۆ کــــەم زۆخــــاو هێجــــرانم وەردەن

ئــــەمجار کــــزەی تــــۆ تــــەمامم کــــەردەن

## چراخم! جەی ڕۆ

چــرا خــم! جــەی رۆ، چــرا خــم! جــەی رۆ

مــن جــە ڕۆی ئــەزەڵ مەتەرســام جــەی ڕۆ

مزانـــام گـــەردش ئـــی چـــەرخ بـــێ پـــۆ

مەکـــەرۆم مـــەحرووم جەدیـــداریێ تـــۆ

رۆی وەسڵــت هــەر بــیم ئــەی رووە پــێم بی

جــــەوبۆ هــــەر ڕۆڕۆ خــــودێم بی

هـــا، فەڵـــەک ئـــەوڕۆ نیشـــان دادەن پـــێم

ئـــای ترســـیاگەکەی گیرئـــاوەردە وێم

ئیســـە، کـــێ تاقـــەت دووری تـــۆ دارۆ؟!

دەک بـــەرق غـــەزەب و بـــەختم وارۆ!

پـــەی چێشـــەن ئـــی عـــومر تاڵـــتەر جـــە ژارە

ئـــی ئـــەعزای بـــێســـەرف مەینـــەتان پـــارە

چوونکـــه کۆچمـــەن جـــه دیـــداریٚ تـــۆ
هەریـــــەک وەدەردیٚ بـــــا گرفتـــــار بـــــۆ

دیـــدەی نـــەوینۆ هـــەر ســـەحەر دیـــدەت
نـــــەدیۆ وە خـــــاڵان قـــــودرەت رەژیـــــدەت

ئەودیـــــدە وە نـــــیٚش نیٚشـــــتەر کنیـــــابۆ
بینـــــائیش ویٚنـــــەی زۆڵـــــفت ســـــیابۆ

زوانـــــیٚ هەرشـــــەو چـــــەنیت نـــــەبۆ بـــــاس
فـــەرەق فـــەرەق بـــۆ چـــۆن ســـفتەی پـــەڵاس

دەســـــتیٚو نەگیٚڵـــــو نـــــە تـــــۆی پـــــەلکانت
گاگـــــا نەکـــــەرۆ شـــــانەی زۆڵـــــفانت

ئـــەو دەســـتە گەســـتەی مـــار پـــەڕ ژاربـــۆ
وەگـــازیٚ مـــاران لـــــەتار بـــــۆ

گۆشـــــیٚ نەژنـــــەوۆ ڕیٚـــــزەی ڕازیٚ تـــــۆ
ئـــەو چفـــەی وەنـــەرم دڵ نـــەوازیٚ تـــۆ

هەرپــەی ئێــد خاســەن ئــەتروش بــۆ دەربــەس

بـــادا، نەشـــنۆ وەهـــنی دەنـــگ کـــەس

وەلحاســـــڵ ژیـــان بـــێ دیـــدارێ تـــۆ

بەدتـــەرەن جەمـــەرگ،نەونـــەمامێ نـــۆ

«ئەحمـــەد» ئومێـــدش بـــە دانـــای داوەر

یاتاقـــەت،یـــا مـــەرگ، یـــا وەسڵـــێ دڵـــبەر

## کاکە یەند دووریت دەروونم کاوان

کاکـــــە یەنــــد دووریـــــت دەروونم کـــــاوان
چـــون «قـــەیس» مـــەجنوون وێڵـــم نـــەکاوان

شـــــنەفتم بـــوی عێشـــق جانـــان مـــەیۆلێت
دەک ڕۆیـیێ سـەد جـار بـوون وەگـەردێ[1] پێـت

بەڵـــــێ چ حاســـــڵ، شـــــای وەفـــــاداران
مــــــەجرووح غـــــەمزەی تیـــــپ تـــــەتاران

مەتەرســـــــوون وەی دەرد تــــــۆ نەدینـــــەوە
وەی فــــــەغان بـــــەرز، زاری و شـــــینەوە

ســــــەربنیەون وەخـــــاک ئەلحەدســــەرای نــــۆ
بمــــــــانۆ وەحەشـــــــر دەرد دووری تـــــــۆ

١- ئاماژەیە بە ئەم بەیتەی لە «خورشید و خاوەر»:
مەرهەمەن پەرێ دەوای ئێش و نێش/بستانە سا بۆی جانان مەیۆ لێش

**ولە**

خالّـــۆ! مـــەنزڵ چـــی ســـەرکەردەکەی دەرد
تـــەمام بـــە تـــۆ بـــێ ئـــاخ یەچێشـــت کـــەرد
وەختـــــێ بـــــەو گـــــەردەن ســـــیم ســـــافەوە
چـــــون وەش غـــــەزاڵان و بـــــۆی نافـــــەوە
دەورمـــــدا نـــــەپێچ ئـــــەو کـــــاو ئەوبـــــەردە
بـــۆ پەخشـــانیش بـــێ ئـــەی هـــەرد بەوهـــەردە
ئـــەو بـــۆ جـــەو تـــەرەف سـۆب نەســـیم مـــاوەرد
هـــەردەم جـــە دووریـــش زام ســـارێش مەکـــەرد
خـــەیلێ دێـــرت کـــەرد ئافـــەرین چـــەپ گـــەرد
بـــەو بـــۆ دڵشـــاد بـــیم ئـــەوچیت لابـــەرد
ئیســـــە ئـــــەو گەنجـــــە، بـــــەو لارەو لەنجـــــە
ڕەنجـــە کـــەرد پەنجـــە، شـــی پـــەری «پەنجـــە»

ئــــەی خـــــوا: ســـــا تــــەن، وەی زام خـــــەریکی

دیـــــــدار وەی دووری، مـــــــەرگ وەی نزیکـــــــی

ئــــەو لای کـــــێ بـــــەروون ئــــەی ڕاوتـــــەدبیرە؟!

ئـــــاخ! جــــــەی تـــــەدبیرە، داخ! جەوتەقــــــدیرە

خــــەیر، مەینـــەت زەدەی جـــە گیـــان هەراســـان

بەختـــــە ســــــیاکەی وێــــش زووتـــــەر ناســــــان

فـــانی بــــێ ئــــەو هــــەم جـــە دووری دڵـــــبەر

نــــەک جـــــارێ، ســـــەد جـــــار «الله اکـــــبر»

## چراغ وەفاتم

چـــــراخ وەفـــــاتم، چـــــراخ وەفـــــاتم

زێنـــــهار، هـــــا، ئامـــــا، وادەی وەفـــــاتم

هوجـــــووم کـــــەرد، ئامـــــا ســـــپای مـــــەماتم

تـــــاراج کـــــەرد ئێقلـــــیم مۆڵـــــک حـــــەیاتم

نەســـــیب نەهـــــەرکۆ ســـــازا مـــــەزارم

گڵـــــکۆ کـــــەرد نەبەنـــــد رای ئێختیـــــارم

دەســـــتم دامانـــــت، نەونـــــە مـــــام نـــــۆ

بەشـــق ئەوکـــەس کـــەرد مـــن جیـــا جـــە تـــۆ

چوونکـــە حەســـرەتان وگـــڵ بـــەردەی تـــۆم

«قـــەیس» وێـــران مـــاڵ گیـــان ســـپەردەی تـــۆم

جارجـار نـەڕووی لـۆ تـف قـەدەم رەنجـان کـەر

تەشـــریف وەســـەرین ســـەر گڵـــکۆم بـــاوەر

نــــــەوا شـــــەرارەی دووری بـــــاڵای تـــــۆ

چـــۆن دەســـــتەی ئـــایر بگنـــۆم وەگلکـــۆ

فیـــدات بـــام، حەیفـــەن وەبۆنـــەی تـــۆوە

عالـــــەمێ یەکســـــەر بســـۆ چـــۆن پــــووە

## پەی چێش نەشۆ جێش

پەی چێش نەشۆ جێش، پەی چێش نەشۆ جێش
سا پـەی چـێش دیـدەم زۆخـاو نەشـۆ چـێش؟
دەروونم جـــــەداخ چـــــەنی نـــــەبۆ ڕێـــــش
پـــەرێ چـــێش بـــەختم ســـەنگ نـــەوارۆلێش
دڵـــــە! ســـــاوەختەن بـــــا بـــــەیو ناڵـــــەت
دیـــــدە! جـــــە زووخـــــاو پەڕکـــــەر پیاڵـــــەت
جەســـتە! ڕەنگـــین کـــەر، ئامـــان ســـەد ئامـــان
وەهـــــــوون زامـــــــان ســـــــەرتا وە دامـــــــان
پـــەی چـــێش قیبلەکـــەی شـــیرین ڕازکـــەم
ڕۆشـــــنایی عـــــەین، ئـــــاوات وازەکـــــەم
یانـــێ هـــای لـــەیلی کـــۆی کـــەڵاف نـــەپێڵ
ڕۆحەکـــەی جەســـتەی قـــەیس ئـــەراگێڵ

یاهـــا، تـــەن خەســـتەی تـــیر دیـــاش بـــێ

دڵ زامـــداریێ مـــار زۆڵـــف ســـیاش بـــێ

ئـــەوجا هەرکەســـێ مـــەوات ئـــەی دەردم

تەعنـــە لـــێش مـــەدام مـــەناش مەکـــەردم

ئیســـە ئەوەنـــد دەرد لـــە لام بیـــەن جـــەم

خـــوا تۆبـــەم بـــۆ مـــەنای کـــەس نەکـــەم

## گڵکۆی تازەی لەیل

گڵــکۆی تــازەی لــەیل گڵــکۆی تــازەی لــەیل
ئــارۆ شــیم وەســەر گڵــکۆی تــازەی لــەیل
نــە پایــەی[1] مــەزار ئــەو لــەیلێ پــڕ مــەیل
نەدیــدەم رێــزا ئەســرینان چــۆن ســەیل
شــیم وەســەرینش وەدڵــەی پــر جــۆش
ســەنگی مــەزارش گێــرتم نــە ئــاغۆش
واتم ئــەی دڵســوز[2] قــەیس لۆنــگ وەکــۆڵ
مــەبارەکت بــۆ یانــەی بیــدی چــۆڵ

١- شیم نە پای مەزار... نوسخەی پ.
٢- سۆزەی ... نوسخەی پ.

ســـەرهۆردە نـــە خـــاک[1] ســـەوڵ خـــەرامان

مـــن مـــەجنوونی تـــۆم وەی تـــەورپێم ئامـــان

کۆچـــێ بـــێ وادەت کـــارێ پـــێم کـــەردەن

بێـــــزارم جـــــەگیان، رازیم وەمـــــەردەن

گـــڕەی[2] نـــارێ عێشـــق دووری بـــاڵای تـــۆ

کـــارێ پـــێم کـــەردەن نـــەو نـــەمامێ نـــۆ

وەختــەن وێنــەی قــەیس لێــوەی لۆنــگ وەکــۆڵ

تـــەن بـــۆ وە خـــۆراک وەحشـــیان چـــۆڵ[3]

ســەوگەند بــەو خــاڵان فــیرووزەی وەش ڕەنــگ

بــەو دەســتەی زۆڵــفان پەشــێویای پــای ســەنگ

جـــەو ســـاوە گـــەردش چـــەرخ پـــەڕ ســـتەم

مـــن و تـــۆ وەی تـــەور جیـــا کـــەرد جەهـــەم

١- نەخاو، نوسخەی پ.

٢- کوورە... نوسخەی پ.

٣- وەختەن چۆن قەقنەس ببووم بە زوخاڵ/شـاد بــۆ وەگــەردم زەلان یـا شەمـــاڵ (نوسخەی پ)

تــۆ بــەردەن و خــاک ســیای تــەنگ وتــار

مــن مــام پــەی ئــازار جــەفای رۆژگــار

نەبــــەڕۆ ئـــارام، نەشــــەو خاومــــەن

چــۆن چــەم گــل کــەران گلاراومــەن[1]

هــەررۆ چــۆن[2] مــەجنوون خــاتر جەخــەم کــەیل

هــەر لــەیل لەیلمــەن نەهــەردەی دۆجــەیل

خــــەمان، پــــەژاران، رەفێقــــی ڕامــــەن

چــەنی جــەفا و جــەور دایم ســەودامەن

ســپای خــەم بــەو تــەور هوجــووم ئــاورەردەن

قافڵــــەی فـــامم وەتــــاراج بــــەردەن

زامتــان ســەخت، ئــەی دڵــەی بــەرئێش

چــۆن جــای مــاران گــاز زۆخــاۆ مــەیو لــێش

١- لە نوسخەی ئەسڵیدا نەبووە هی نوسخەی «پ»یە.

٢- بە وێنەی مەجنوون.

شـــــەو کەیلـــــەن زۆخـــــاۆ وەلای جێمـــــەدا
کـــــافر بـــــەزەئیش مـــــەیو پێمـــــەدا

یانـــــەم وێرانـــــەن، دەردەم دێویـــــان[1]
چـــۆن ئـــاهووی تـــەنیا سەرڵـــیم شـــێویان

شـــــەوان زاری و شـــــین[2]، روان ڕوڕومـــــەن
یـــەکجار[3] وەسوەســـەی تـــەیفایی تۆمـــەن

یەحاڵـــــی منـــــەن[4] شـــــای وەفـــــاداران
هـــامرازی تـــۆ کـــێن[5] ســـەباو ئێـــواران؟

چ تـــەوەر مـــەویاری، چوونـــەن قـــەرارت
کـــین، هـــام سـۆحبەتێ لـــەیل و نـــەهارت؟[6]

١- دیۆیان ستارەم شوومەن بەختم لێویان. (نوسخەی پ)
٢- شەوان تا وەڕۆ... (نوسخەی پ)
٣- فێشتەر... (نوسخەی پ) گشتش پەژارە... (نوسخەی پ)
٤- تۆ چوونەن حاڵت... (نوسخەی پ)
٥- کێن هامرازت...؟ (نوسخەی پ)
٦- لە نوسخەی سەرەکیدا نەبووە، هی نوخسەی پێیە.

نەوســـەرای تاریـــک پـــەر خـــەوف و خەتـــەر
مـــۆدارات چوونـــەن سەوڵـــێ[1] نازپـــەروەر؟
نـــەی ســـەردی هـــەوای ســـەردی سیاســـەنگ
چ تـــەورەن خـــاڵان فـــیروزەی وەش رەنـــگ؟
جەیاگـــەی بـــاهووی قەیســـی خـــەمینت
کـــام ســـەنگێ ســـیان هـــا نـــە باڵـــینت؟[2]
داخـــم ئـــەو داخـــەن لـــەیلی خـــاتر تـــەنگ
ئـــەو دەســـتەی زۆڵـــفان ســـەودایی ســـیوەنگ
و هـــەودای[3] چـــل‌چـــەنگ تـــۆ تاتـــات مەکـــەرد
ئیســـە پەشـــێویان چـــون رێحـــانی هـــەرد
ئـــەو دیـــدەی مـــەخموور ئـــاهووبێز تـــۆ
ئـــەو قـــەوس قـــەتران شـــەڕئەنگێز تـــۆ

١- لەیل... (نوسخەی پ)
٢- جە تەنخوای باهووی قەیسی وەرینت/کام سەنگی سیا هانە سەرینت؟
لە جیاتی باهووی قەیس خەمگینت/کام سەنگی سیا شەو جە باڵینت
٣- وشانەی چل... (نوسخەی پ) مەدای چل... (نوسخەی سەرەکی)

ئیســـە لـــە گـــەردش چـــەرخ نیلـــی رەنـــگ

بـێ رەونـەق بیـەن چـۆن نـەقش روی سـەنگ

ســا پــەی چـێش سـۆمای دیـدە تـار نـەبۆ

زینـــــدەگی جـــــەلام ژارمـــــار نـــــەبۆ

تـــۆ خـــەریک قـــەبر، ســـیای ســـەردەنی

تـــەقام حەســـــرەتان وەگـــــڵ بـــــەردەنی

مـن تـەنیا چـۆن قـەیس لێـوەی خـەم خـەڵات

زینـــدە مەگیڵـــوو نـــە ڕووی ســـەر بەســـات

وەلحاســـڵ هـــەر چەنـــد، شـــین و زاریم کـــەرد

نـــەپای قەبرلـــەیل، بـــێقـــەراریم کـــەرد

جـــوابش نـــەدا زەڕڕێـــو دەنـــگ نەکـــەرد

یـــەکجار بڵێســـەم جەگـــەردوون ویـــەرد

دیســـان هـــەم جـــە نـــۆ واتم: ئـــەی دڵســـۆز!

حـــــەکیم دەردان دەرد مـــــەجنوون دۆز[1]

---

١- سۆز... (نوسخەی پ)

یەپـــەی چـــێش مـــەیلم جـــەلات کـــەم بیـــەن

مـــــەر عەهـــــدو پـــــەیمان جـــــەیادت شـــــیەن

مـــــن وەی دڵـــــەی خـــــار بـــــێ قـــــەرارەوە

وەی جامـــــــــەی ســـــــــیای یەخـــــــــەپارەوە

هـــــام نـــــــە ســـــــەرینت، زار زار منالـــــــوو

خـــــاکیانـــــەی نـــــۆت وچـــــەم مماڵـــــوو

تـــۆ هـــیچ نیـــت و تـــەنگ بـــێقـــەراری مـــن

جـــە ئەلوێـــدای ســـەخت شـــین وزاری مـــن

نمـــــەدی جـــــواو، نۆختـــــەی خـــــاڵ بێگـــــەرد

مەعلوومـــەن جـــەلات، مـــەیلم بیـــەن ســـەرد

دیم ســـــەدایێ نـــــەرم، نـــــە تـــــۆی خاکـــــەوە

نەیانـــــەی تـــــازەی حەســـــرەت ناکـــــەوە[1]

---

١- دیم دەنگێ ئاما نـە تـۆی خاکـەوە/ جەیاگـەی تاریـک سـامناکەوە... (نوسـخەی پ)/ نەویانەی تاریک حەسرەت تاکەوە...

ئامـــــا نەگۆشـــــم چـــۆن هــــەردەجاران[1]
واتـــش: ئـــەی مـــەجنوون وڵـــی کۆســـاران!
ســەوگەند بــەو ئەحــەد[2]، فــەردێ بــێ هــەمتا
و بــێوادە کــەرد، قــەیس جــە[3] لــەیل جیــا
ڕای جــــواو نیـــــەن، دڵ بـــــێ قــــەرارەن
خـــەیلێ ســـەنگ و خـــاک وەجەســـتم بـــارەن
جـــە تەئســـیر خـــاک، هـــەوای سەردســـەنگ
رای جـــواو نیـــەن، چـــەنیت کـــەروو دەنـــگ[4]
خـــان خـــاک وەی تـــەور، مەحبووســـم کـــەردەن
نـــــــازاران وێم، جــــــەیادم بــــــــەردەن[5]
بەڵـــــێ، تـــــۆ هەرچەنــــد زاری مەکــــەری
هــەر چەنــد ســـەر وەســـەنگ ســـیامەدەری[6]

١- رازی... (نوسخەی ب)
٢- خودای... (نوسخەی پ)
٣- من جە تۆ... (نوسخەی پ)
٤- چەنیت کەرۆ دەنگ
٥- خاک و دەستی زۆر زنجیرم کەردەن/یادی هامڕازان جەویرم بەردەن... (نوسخەی ب)
خاک و سەنگ وەی تەور زنجیرم کەردەن/فکر نازاران جەویرم بەردەن...(نوسخەی پ)
٦- بەڵام تۆ هەرچەند زاری مکەری/هەرچەند سەروە سەنگ سیا مدەری...(نوسخەی پ)

فایـــــدەش نیــــەن، ســـــوودمەدارۆ پێـــت
بشـــۆ زاری کـــەر، پـــەرێ بـــەخت وێـــت
پــەی چــێش؟ ئـی دنیـا خــەیلێ بـێ وەفــان
جـــە تـــەنخوای وەفـــاش،دایم هـــەر جـــەفان
کـــەس جـــە قەیـــد دام مـــەکرش نەڕەســـتەن
یەکەیـــەک وە زەنجـــیر عـــەیاری بەســـتەن
جـــە «یـــوم الاســـت» تـــا وەڕۆی مەحشـــەر
کـــەس جـــەدام مـــەوت بـــەر نەشـــین وەبـــەر[1]
هەرکــەس دڵ شــاد بـۆ، پــەی دنیــای بـێ پـۆ
ئـــــاخر پەشـــــیمان مـــــەبۆ رەنجـــــەڕۆ
هـــەر چەنـــد پـــەرێ مـــن شـــین و زاریتـــەن
نـــــەپای قـــــەبر لـــــەیل بـــــێ قەراریتـــــەن

---

١- ئەم دێرە هی نوسخەی «پ»یە لە نوسخەی سەرەکیدا وا هاتووە:
جە ئەوەڵ دنیا تا وە ڕووی مەحشەر/هیچکەس جە دامش بەر نەشین وەبەر

هــــەر چەنـــــد پــــەریێ مــــن تـــۆ ئەلوداتـــــەن

ئـــــاخر، ســـــەرئەنجام ئـــــیجاگـــــە، جاتـــــەن

هێنـــــدە خـــــاک و ســـەنگ و جەســـــتم بـــــارەن

نـــــە جاگـــــەی جـــــواب، نـــــەڕای گۆفتـــــارەن

ئەحمـــەد پـــەریێ کـــۆچ، شـــای جـــەمین جامـــان

رەســــــتاخیز کــــــەرۆ تـــــا مـــــــەرگ ســــــامان[1]

*****

١- ئاخرین دێری ئەم شیعرە بە دوو شێوازی جیا لە نوسخەکانی ب و پ هاتووە.
یە ئەحمەد واتەن بەی گەشت ئەندووە/وەختەن سەر بنیو وە ڕووی گل کووە...(نوسخەی پ)
ئەحمەد پەری کوچ بێوادەکەیە/ئەسرین نەدیدەش موارۆ چون سەیل...(نوسخەی پ)
ئەو بەڵگە کەوا مینورسکی هێناویە پەنجا و سێ دێڕە.

## فەرهەنگۆک

### ا

ئارۆ: «هـ»[1] ئەمڕۆ
ئالا: «هـ» ڕەنگی لیموویی
ئامام: «هـ» هاتم
ئامان: «هـ» هاتووە
ئامای: «هـ» هاتی
ئاوات واستە: «هـ» ئاواتە خواز
ئاوان: «هـ» ئاوەدان
ئاهێر: «هـ» ئاگر
ئاهۆ بێز: «هـ» «بێز» لە سەر چاوەی بێزمان، بێزار بوون، بێزارکەری مرۆڤ لە ئاهۆ، ئاوڵناوی بکەری تێکەڵی مورەخەم کە لە جیاتی ئاوەڵناوی بەرکاری بەکار هێنراوە. سەدەف بێز، شەوبۆبێز، قەناوێزبێز، لەم وێنانەن.
ئەراگێڵ: «هـ» چۆڵگەرد
ئەرجۆم: «هـ» ئومێدم، لە چاوگەی «رجا»
ئەژنین: «هـ» بیستن
ئەسرین: «هـ» فرمێسک
ئەسفەر: «ع»[2] زەرد
ئەشجار: «ع» درەختەکان
ئەوداڵ: «هـ» عەوداڵ
ئەوگار: «هـ» گرفتار
ئەی تاق پەی ئەو تاق: «هـ» لەم کاتەوە تا ڕۆژی دیکە، هەر شەو و ڕۆژ جارێک
ئەی رووە: «هـ» ئەم ڕۆژە
ئێدەن: «هـ» ئەمەیە
ئێش: «هـ» ئازار

### ب

بارەن: «هـ» بارە «ـَ ن» جێناوی لکاوە، جێگری کارە
بام: «هـ» ببم
باوەر: «هـ» بێنە
باهوو: «هـ» قۆڵ ( بازو)
بە شق: «هـ» کورت کراوی «بە عەشق»

---

١- (هـ) نیشانەیە بۆ وشەی هەورامی.

٢- (ع) نیشانەیە بۆ وشەی عەرەبی.

بەڕەزا: «هـ» نەوعە گیایەکی بۆن خۆشە کە لەسەر گاشەبەردی ئەشکەوتەکاندا دەڕوێت
بەر: «هـ» بیبە
بەردەنی: «هـ» شیاوی بردن، ئاوڵناوی شیاوی
بەرزان: «هـ» بەرزاییەکان
بەرزەن: «هـ» بەرزە
بەرنەشین: «هـ» نەرۆیشتووە
بەگ: «هـ» بەغ، گەورە
بەن: «هـ» زنجیر، زیندان
بەیان: «هـ» کۆی «بەی» خواستنە لە سینە و مەمکی ئافرەتان
بەیدێ: «هـ» بێن
بەین: «هـ» نێوان، بەڵێن، عەهد و پەیمان
بێخەوش: «هـ» بێعەیب، ئەو پەڕی جوانی
بێمەجاز: «هـ» توورە
بدۆزانەوە: «هـ» دووراندنەوە، دروون، دروومان
بدۆم: «هـ» بمدات
بدۆم: «هـ» بمداتێ
بڕیان: «هـ» بڕاوە
بزان: «هـ» بزانە
بزانۆ: «هـ» بزانێ
بسرەوە: «هـ» سرەوتن، ئارام بە
بشۆ: «هـ» بڕۆ
بکەران: «هـ» بیکەن
بکەروون: «هـ» بیکەم
بکیانە: «هـ» بنێرە
بگێڵۆ: «هـ» بگەرێت
بوارۆ: «هـ» ببارێت
بوەران: «هـ» بخۆن، لە چاوگەی واردن «خواردن»
بووڵ: «هـ» خۆڵە مێش
بویەر: «هـ» تێپەڕە، چاو پۆشی بکە
بۆ پرووز: «هـ» بۆنی پەڕی سووتاو
بۆ کەرە: «هـ» بۆنی بکە
بۆرێ: «هـ» بێ
بیدی: «هـ» بیابان، چۆڵ و بیاوان
بیگلەربەیگی: «هـ»سەرۆکی کوێخاکان، بەرپرسی شارەوانی

## پ

پاسەیچە: «هـ» ئاوەهاش
پاڵا: «هـ» پێڵاو
پلووسکە: «هـ» پلووسک
پەرێت: «هـ» بۆ تۆ
پەرێم: «هـ» بۆ من
پەرێو، پەرێ: «هـ» بۆ، پێرەکە
پەشێویا: «هـ» ئاڵۆز و پەشێواو
پەنەش: «هـ» بەئەو
پەنجەوشاران: «هـ» پەنجە گۆشین، وشاران ئاوڵناوی ئاستیە لە چاوگەی «وشاردن»، بەرانبەر ئەم وشەیە لە فارسیدا «فشردن» و لە کوردی سۆرانیدا وشەیەکی تەرکیبیە «فشاردان» و «گوشاردان»

پەی پەی: «هـ» بە شوێن یەکتردا
پەی چێش: «هـ» بۆچی؟
پەیکۆڵ: «هـ» دڕک و داڵ
پێشەن: «هـ» پێیە
پێکیا: «هـ» زامدار بوو،
پێم: «هـ» بەمن
پێوە: «هـ» لەگەڵ ئەودا، تێکڕا

**ت**

تاتا: «هـ» تاڵ تاڵ
تاس: «هـ» خنکاو، لە چاوگەی «خنکان»، خنکانی کەسێک بە تەناف لە مل بوون
تاسە: «هـ» ئارەزوو بۆ بینین
تاش: «هـ» کێوی بەرزڕ، زنار، ڕەوەزی بەردین، تاشەبەرد، بەردی ساف، تاڵێک لە مووی ئەو
تاڵە: «هـ» تالێع، بەخت، تاڵ
تاق تاق: «هـ» تاڵ تاڵ «تاڵی موو»
تاق: «هـ» سرمیچی ماڵ، بەرزایی ئەشکەوت
تاق: «هـ» تەنیا، تاک
تاقی: «هـ» ئەزموون، تاقیکردنەوە
ترپە: «هـ» دەنگە ناوە بۆ دەنگی پێڵاو بە سەر ئەرزدا یان دەنگی تووڵی هەلاج بە سەر ژێرخەر (دۆشەکە)
ترسیاگە: «هـ» ترساو( کە) ک چکولە کردن، سووکایەتی
تریکە: «هـ» دەنگە ناوە بۆ پێکەنین

تووڵ تووڵ: «هـ» ڕا ڕا
تویچ: «هـ» تۆش
تەنخوا: «هـ» بە جێی من
تەواسان: «هـ» سەرسوڕماو، تاساو، تاسیان بە هۆی گوشاری زۆرەوە
تەوەن تاو: «هـ» بەرد تاوێن
تەوەن: «هـ» بەرد
تەوق: «ع» ملوانکێک لە زنجیر
تینی: «هـ» تینویەتی

**ج**

جەبۆنەو تۆوە: «هـ» بە بۆنەی تۆوە
جەسەم: «هـ» جەستەم
جەلات: «هـ» لە لای تۆ
جەوساوە: «هـ» لەو کاتەوە
جەیر: «هـ» ئاسک
جێت: «هـ» لە تۆ
جێش: «هـ» لە ئەو

**چ**

چار: «هـ» قودرەت، چارە
چنوور: «هـ» ناوی گوڵێکی بۆن خۆشە لە کوێستان دەڕوێ
چەردە: «هـ» لەوەڕاو
چەم: «هـ» چاو
چەمیا: «هـ» چاو قرتان، کۆم بۆوە
چەنەت: «هـ» لە تۆوە
چەنیت: «هـ» لە گەڵ تۆ
چەیلە: «هـ» گرتن
چێشەن: «هـ» چی بووە؟

چینە: «هـ» لە ئائەمە

## ح

حەی وەچ: «هـ» توولەمار، مەبەست قژی ئافرەتانە کە لە سالانی دووردا وەک ڕازاندنەوە و ئاڕایشت کردوویانەتە پەلکە لەنێو شانیان یا لە لای ڕۆخساریان ئالۆزاوە، شاعیران بەو دوو پەلکە کەوا لە لای ڕوومەتیان بووە شاماران یا ئەژدیهایان وتووە، پەلکەی نێو شان و پشتی سەر بە «چل گیسو» ناو براوە. میرزا شەفیع ئەفەرمێت: زلێخا ئەژدەر دووسیا سەعبان/ پڕ پێچ ئەژدەر چەنی مارەوچان

## خ

خام: «هـ» خاو

خان: «م»[1] وشەیەکی مۆغولیە. لە زاراوەی هەورامیدا بە مانای گەورە، لێرە بە مانای زالم هاتووە

خاو: «هـ» خەو، هەر کاتێک ئەم وشە لە گەڵ زۆڵف یان خەیاتە هاتبێ بە مانای ئاوڵناوە بۆ زۆڵف بە مانای زوڵفی شانە کراو و حاڵەتی سرۆشتی زوڵفە

خاومەن: «هـ» نەشەو خاومەن، نەشەو خەم هەیە.

خەریک: «هـ» سەر قاڵ، چاوەڕێ

خەزێنە: «هـ» خەزێنەی شایی

خەڵات: «هـ» خەڵات، بە مانای «کەفەن» یش هاتووە

خەمان: «هـ» کۆی خەم، غەم، غەمەکان، خەمان، کۆکراوەی وشەی غەم، پیتی «غ» کاتێک لە فارسیەوە هاتووتە نێو شێوەزاری هەورامی بووە بە «خ»

خەمیا: «هـ» خوماری چاو

خەمین: «هـ» خەمگین

خەیاتە: «هـ» کاکۆلی زێرین خواستن لە قژی درێژی بۆر و زەرد

خەیچ: «هـ» ئوخەیچ، بۆ ئارامش و خۆشی

خوونکار: «هـ» بێ‌ڕەحم، خوێن‌ڕێژ

خۆی: «هـ» عارەقی سەرو ڕوومەت

خیاوان: «هـ» خیابان، شەقام، بۆ ڕوون کردنەوەی زۆرتری مانای ئەم وشە بروانە بۆ لاپەڕەی ۲۰۳ کتێبی « مکتب استاد، لە سەعیدی نەفیسی

## د

داوا: «هـ» شەڕ، ئاژاوە

دەپێڵ: «هـ» پشت، لە شان تا سەر

دەک: «هـ» دەنگە ناوە بۆ ڕووداو کە لە کتوپرێکدا دەیلێن.

دەم مەدەر: «هـ» قسە مەکە

دەماخت: «هـ» دەماخی تۆ : وشەی غ بووە بە «خ» خواستن لەسەر خۆشی، بەرزە دەماخی و بەرزەفڕی

دەیری: «هـ» دێوانە

دێز: «هـ» جۆرێ ڕەنگە، وەکوو ڕەنگی

---

[1] - (م) نیشانەیە بۆ وشەی مغوولی.

شەرابی، تێکەڵاوی خەنەوقاوە. ژنان بە پێی ڕەسمی باو ئەو ڕەنگەیان گرتووە لە سەریان.
دێویان: «هـ» تێک چوو
دنیای بێ پۆ : پۆ، «تان و پۆ» بێ پۆ، بێ بەقا، فانی
دوجەیل: «ع» چکۆلەبووی «دیجلە» بەڵام لە زاراوەی شاعیرانی کوردا بەو بیابانە دەڵێن کە قەیسی بەنی عامر لە وێ نیشتەجێ بووە.
دوساخ: گۆڕدراوی وشەی دەستاق کە وشەیەکی تورکیە، لە مانای سجن و زیندان بە کوتوو و زنجیرەوە
دوورنە هەوالان: «هـ» عاشقی دوور لە خۆشەویست
دیاری: «هـ» ڕوانین
دیرەک: «هـ» کۆڵەکە
دیم: «هـ» بینیم

## ر

ڕاگە: «هـ» ڕێگە
ڕێزا: «هـ» ڕژاندی
ڕوو: «هـ» جوان، لاو
رایێ: «هـ» جارێک
رەژیدە: «هـ» نیگار کێشراو
رەشتەن: «هـ» نیگاری کێشاوە
رەمای نەوهالان: «هـ» خۆ شارینەوەی تێکەڵ بە شەرمی کچە تازە پێگەیشتووەکان

ڕێزەی راز: «هـ» بە پچەونەرمی قسەی دڵداری کردن

## ز

زانان: «هـ» دەزانن
زانای: «هـ» زانین
زەلان: «هـ» یان بای ڕۆژئاوا باییکە لە لای ڕۆژئاواوا هەڵدەکات پێگەکەی دەریای مدیتراتە و ئەتڵەسە و دەگاتە هەر لایێ نماویەکەی خۆی جێ ئەهێڵێ کە لە کوردیدا بەو بایە زەلان یان چیەبای پێ دەڵێن.
زگار: «هـ» زامدار و پەرێشان، زویر
زنۆ: «هـ» دەزانێت، بزانێت
زوێری: «هـ» عاجزی
زووخاو: «هـ» ناوێکی تێکەڵ، زیادبووی مەقلووبی ئاو و زووخ لە ئاژخ، زخ بالووکێکی چکۆلەی سفتە لەسەر پێستی مرۆڤ سەردەر دەهێنێ و ئازار و ئێشی نیە، لە عەرەبیدا ثوء لولە و لە فارسیدا «سگیل»، «زگیل»ی پێی دەڵێن هەرکات چلک بکات هەمووی لەش لەبەر دەگرێ و زۆر ئازاردەرە و لە زمانی کوردیدا هەر چلکێک کە چلکاوی لێ بێ پێی دەوترێ زووخاو.

## س

سا: «هـ» سێبەر
سارێش: «هـ» سۆکنایی
ساوا: «هـ» تازە، کۆرپە

ساوا: «هـ» ساوی
سەبا: بەیانی
سەبوون: هـ» «بای سام و بای سەبوون» سام بە مانای ژارداریان بایەک کەوا ژاری پێوە بێت، ئەم دوو بادیەی ناوچەی گەرمیانن
سەربەرزان: «هـ» لووتکەی کێوەکان، بەرزاییەکان
سەرەو چێر: «هـ» بەرەو خوار
سەرەوکووی: «هـ» بەرەو ژوور
سەرکلاو: «هـ» لووتکەی کێو
سەروەش: «هـ» سەر خۆش، «وەش» گۆڕدراوی وشەی (خۆش) واکی «خ» لێ کەم بووەتەوە
سەرینش: «هـ» باڵینی ئەو، ژوور سەری ئەو
سەما: «ع» گۆڕدراوی سەماع (عەرەبی) بە مانای هەڵپەڕکێ و خۆشەکاندنەوە و هەڵخستنەوە.
سەوام: «هـ» جیام
سەوزی ساوا: «هـ» کچی ئەسمەری تازە پێ‌گەیشتوو.
سەوڵ: «هـ» ناوی درەختێک کەوا نموونەیە بۆ بالابەرزی
سفتەن: «هـ» لە بنەڕەتدا بە مانای سمین، بەلام شاعیرە هەورامیەکان بە جێگای «سوتەن» بە مانای «سووتان» هێناویانە، وشەی «سفتە» هەر لەم سەرچاوە لەوشەی هەورامیدا زۆر جار بە مانای «خۆڵەمیش» هاتووە.
سکالا: «هـ» گلە و گازەندە
سواری: «هـ» رەشایی
سوون: «هـ» زۆر گەرم
سۆ: «هـ» زامی نوێ، کولانەوەی زام
سۆتە: «هـ» سووتاو
سۆچیا: «هـ» سووتا
سۆما: «هـ» رۆشنایی
سیا چۆ: «هـ» داری رەش
سیا دەوار: «هـ» رەش ماڵ
سیامالان: «هـ» رەش مالان
سیان: «هـ» رەشە، سیا، رەش
سیوەنگ: «هـ» زۆر رەش، چاوی رەش، سێ جار کلْهِ تێ‌کرابێ

## ش

شەتاو: «هـ» ئاوی شەت، ناوێکە کەوا جێ‌بەجێ کراوە، مەبەست ڕووبارێکی گەورەیە کەوا ئەڕژێتە نێو زەریا.
شەفەتەین: «ع» لێوەکان
شەماڵ: «هـ» مەبەست بای شەماڵە لە وێژەی کوردیدا بایەخێکی تایبەتی پێ دراوە.
شێویان: «هـ» شێواو
شنەفتم: «هـ» بیستم
شنۆ: «هـ» شنە، بای فێنک
شۆ: «هـ» ئەندازە
شی: «هـ» رۆیشت
شین: «هـ» رۆیشتووە
شین: «هـ» شین و ڕۆڕۆ کردن، خۆ

کوشتن و خۆ بڕین کە ببێتە هۆی بریندار بوونی ڕوومەت لە سەرچاوەی «رۆیشتن» رەنگە لەبەر ئەوە بێ کە مەرگ، رۆیشتنی گیان لە جەستەیە، یان رۆیشتن لەلای ئازیزان و خۆشەویستانە

## ف

فەرەق، «هـ» فەرەق: جیا جیا بێتەوە
فەرد: «هـ» دێڕێک شیعر
فێشتر: «هـ» زۆرتر
فوتەی شۆر: «هـ» لونگ، کولۆانە

## ق

قرچ: «هـ» دەنگە ناوە بۆ شکاندنی دار
قرچە: «هـ» دەنگە ناو. بۆ برژاندنی گۆشت
قەتارە: «هـ» رزنێ گوڵی چنراوی هەورێشمین کە بە دەزووی زێرین چنراوە، ژنانی کورد دەیبەسن بە سەریانەوە.
قەتران: «هـ» کۆکراوی قەترە
قەتران: «هـ» مادەیەکی ددانی و ڕەش کە لە هەندێ لە درەختان وەک سنەوبەر و عەرعەر و... دێتە خوارەوە
قەڵاخی: «هـ» گوردراوی، وشەی قالاوی ڕەوش
قەناوێز: «هـ» نەوعە قوماشێکی بە قیمەتە
قوتوو: «هـ» گۆڕدراوی وشەی قووتی

## ک

کاو: «هـ» کێو و ئەشکەوتی بەرز و سەخت، جێگای ڕاو، جێگای راوی گیاندارانە، کە نزیک بە ئەشکەوتەکەن
کاوان: «هـ» شکافتوویە
کاوان: «هـ» لووتکەی کێوە بەرزەکان
کەچی: «هـ» لار و لوێر
کەروو: «هـ» دەیکەم
کەرۆ: «هـ» دەیکات بیکات
کەڵ ڕەم: «هـ» سڵ کردنی کەڵە کێفیەکان
کەعبەی رەجۆلەین: «ع» قولەپا
کەی مەی: «هـ» چ کاتێک شەراب (مەی) دێنیت؟
کەی مەی: «هـ» کەی دیێت؟
کەیل: «هـ» پڕ، لە زمانی عەرەبیدا بە مانای «پەیمانە»یە.
کێن؟ «هـ» کێ یە؟
کرێشمە: «هـ» بە ناز ڕوانین و بە چاو و برۆ ئیشارەت کردن
کزە: «هـ» سۆزی دەنگی هۆرە، سۆ
کڵپە: «هـ» بەرزبوونی شۆڵەی ئاگر
کڵێلان: «هـ» کلیلەی بەفر، کرێوە و بۆران
کنیابۆ: «هـ» هەڵ کنرابێت
کوان: «هـ» کێوەکان
کوڵناتەوە: «هـ» زامت کولاندەوە، تێکت دا

کۆس کەوتە: «هـ» شکست هێناو
کۆس: «هـ» بەرزی، ئاوازە و شورەت
کۆساران: «هـ» کورت کراوی کۆساڵان
کیاست: «هـ» هەناردی

## گ

گێلام: «هـ» گەڕام
گڕە: «هـ» ڕۆشنایی شوڵەی ئاگر
گرد: «هـ» هەموو
گردین: «هـ» هەموان
گڵکۆ: «هـ» کۆی گڵ، گۆڕ، مەزار
گل کەران: «هـ» گل، ئێش، ژان- کەران: کردن، ئەو کەسانەی کە چاویان ئێش ئەکات.
گلاراو: «هـ» ئاوی چاو، ئاومرواری، «ناوی نەخۆشی چاوە»
گوسەستە: «هـ» گەستراو

## ل

لا: «هـ» پاڵ، کەنار
لاتەخەف: «ع» مەترسە
لادی: «هـ» تاوێک
لارە: «هـ» لەنجە و لارە، ڕۆیشتنی بە ناز و خەرامان
لاڵ باڵ: «هـ» لاڵ، کورت کراوی لەعل، بەردێکی بە نرخی سوورە، کە لە قەدیمدا دووراندوویانەتە سەر قوڵوانە یان ئاڵادا، باڵ: قوڵ
لالە: «هـ» پاڕانەوە
لافتی: «ع» جوامێرێک نیە. ئیشارەتە بە حەدیسی «لا فتی الا علی لا سیف الا ذوالفقار»
لانساران: «هـ» کێوە ئیلاخان
لەب بەردەوە: «هـ» لێوی گەست
لەتار لەتار: «هـ» کوت کوت کراوە
لەیل: «هـ» مەعشووقەکەی مەجنوون، لە وێژەی کوردیدا مەبەست هاوسەر و ژنانی دڵبەرە
لێت: «هـ» لە تۆ
لێش: «هـ» لە ئەو
لێلاو: «هـ» ناوی لێڵ، ئاوی ڕەش کە ئەبێتە هۆی کوێری
لێوە: «هـ» شێت، شێواو
لوا: «هـ» ڕۆیشت
لوان: «هـ» ڕۆیشتووە
لونک وەکۆڵ: «هـ» کەفەنپۆش، لیباسی ئێحرام، کۆل: پشت

## م

ماروون: «هـ» دەهێنم
مازە: «هـ» مەهێڵە
مانیا: «هـ» ماندوو
ماویٚ خاڵ: «هـ» موورووی چکۆلەی بەقیمەت و بایەخ، خواستن بۆ خاڵی وردی ڕوومەت و گەردەن
مەبۆ: «هـ» دەبێت
مەبۆ: «هـ» ئەبیٚ
مەبۆسا: «هـ» ماچی دەکرد
مەشنیە: «هـ» لەشنیانەوە دێت، مەبەست لەرینەوەی گەڵای دارەکان. مەشنێوە، مەلەرەوە

مەشیا: «هـ» شیاو بوو
مەشیان: «هـ» دەڕۆیشتن
مەکەری: «هـ» دەیکەی
مەگێلام: «هـ» دەگەڕام، سەیرانم دەکرد
مەماڵۆ: «هـ» ئەماڵیٚ
مەنا: «هـ» گوڕدراوی وشەی «مەنع» «مەنع و لۆمە»
مەنەن: «هـ» ماوەتەوە
مەند: «هـ» ماوە، لە مانەوە
مەندەنان: «هـ» ماوم
مەوەشت: «هـ» دەباری
مەودا: «هـ» تێژایی شمشێر
مەورەشان: «هـ» دەفرۆشن
مەویاری: «هـ» رادەبوێری
مەوینانت پەی: «هـ» بە بۆنەی تۆوە نابینم
مێقراز گاز: «ع» مێقراز (دوێرد) میقراز گاز واتا زوڵفی کورت کراوی پێشی سەر «ئەگریجە» و دەوری سەر نە زۆڵفی کورت ئەگریجە
مداروت: «هـ» دەتپارێزم، ئاگام لێت دەبێت
مدەری: «هـ» ئەوەشێنی
مزانام: «هـ» دەمزانی
مزانوو: «هـ» دەزانم
مزانۆ: «هـ» دەزانێت
مزگانی: «هـ» مزگێنی
مزۆ: «هـ» بڕژێت، ڕوان بێت
مسپارووت: «هـ» ئەتسپێرم
مشۆ: «هـ» دەڕوات
مواچوون: «هـ» دەڵێم
مۆرە: «هـ» گۆڕدراوی وشەی مووروو

## ن

ناسۆر: «هـ» زامی کۆنەی چڵک کردوو
نامانی: «هـ» نەهاتووی
نەتاشام: «هـ» نەمتراشیوە، نەمتاشیوە
نەدیۆ: «هـ» نەڕوانێت
نەزان: خۆی لە نەزانی ئەدا
نەزم: «هـ» گۆڕدراوی وشەی (نبض)ی عەرەبیە
نەزۆ: «هـ» نەزیٚ، ڕەوان نەبێت، بەر نەبێتەوە
نەژنەوو: «هـ» نەبیسێت
نەسەند: «هـ» وەری نەگرت
نەسرەفتە: «هـ» نەسرەوتووە
نەشەندم: «هـ» نەمخستووە
نەشۆ: «هـ» نەروات
نەکێشام: «هـ» نەمکێشاوە
نەمانۆ: «هـ» نەمێنیٚ
نەمەند: «هـ» نەماوە
نەواچی: «هـ» نەڵێیت
نەونەمام: «هـ» نەمامی نۆ، خواستن بۆ قامەتی جوان و ڕێک و پێک
نەوینۆ: «هـ» نەبینێت
نەی کۆ: «هـ» ئاوڵناوی بکەری کە لە جیاتی ئاوڵناوی بەرکاری بەکار

دەهێنرێ
نمازۆ: «هـ» ناهێڵێت
نمانای: «هـ» پیشانت داوە
نمانۆ: «هـ» ئەنوێنێ
نمای مەلالان: «هـ» خۆ نواندنی مندالان
نمەدی: «هـ» نادەی
نمەشوم: بە جێم ناهێڵێ
نمەگنۆم: «هـ» داناکەوم
نوختە: «هـ» گوڕدراوی وشەی نوقتە «خاڵ»
نۆگەمەن: «هـ» نۆگەی منە
نیەن: «هـ» نیە
نیشتە بیم: «هـ» دانیشتبووم

**و**

واتە: «هـ» وتە
واتش: «هـ» وتی
واتم: «هـ» وتم
واچوو: «هـ» بڵێم
وارو: «هـ» بباریێت
وانان: «هـ» خوێندوویە
وەختەن: «هـ» کاتی ئەوە گەیشتووە
وەرتەر: «هـ» سەرتر
وەردە: «هـ» خواردووە
وەرکاوان: «هـ» داوێنی کۆسار، بناری چیاکان
وەرین: «هـ» رابردوو
وەس: «هـ» بەس
وەشەن: «هـ» خۆشە
وەلادیا: «هـ» روانین بە گوشەی چاو گوشە نیگا
وەلای: «هـ» بەرانبەر بە
وەیسی نازار: «هـ» وەیسی قەرەنی (رئیس التابعین) لە کوردەواریدا بە هۆی خۆشەویستی پێغەمبەری خودا -درووود و سەلامی خوای لەسەر بێ- «وەیسی نازاریان» پێ وتووە بە مانای خۆشەویست.
وێم: «هـ» خۆم
وستەنت: «هـ» خستووتە
وشکاو: «هـ» کانی وشک بوو
ویەرد: «هـ» گوزەرا
ویەردەن: «هـ» گوزەراوە
ویر: «هـ» بیر و هۆش

**هـ**

هاژە: «هـ» دەنگە ناوە بۆ ئاو تافگە و
هام دەنگ: «هـ» هاودەنگ
هەرد: «هـ» کێو و بیابان
هەردە: «هـ» هەرد، کێوی بەردین، ئاوارە و سەرگەردان
هەردەجاران: «هـ» ڕۆژگاری بەردەوام، وەک هەمیشە
هەڵوەن: «هـ» گۆڕدراوی وشەی هەڵوان، ئەڵوەند «کێوی ئەڵوەند» ناوی کێوێکە لە شاری هەمەدان
هەنی: «هـ» دیکە
هەنی: «هـ» هەمە، هەیت
هەوا سەنەوە: «هـ» سەر لە نەوێ باڵی

دا، هەمیسان بەرز بۆوە
هەوارگە: «هـ» جێگای خێل لە ئیلاخ
هەوسیاگ: «هـ» ترساو
هێما: «هـ» هێشتا
هێندە: «هـ» تا رادەیەک
هوردەر: «هـ» هەڵکە
هوروەش: «هـ» شۆرش، هەڵمەت
هوون: «هـ» خوێن وون ناوێکی دیکەیە بۆ خوێن
هۆردان: «هـ» هەڵی داوە
هۆز: «هـ» جەماعەتێک کۆچکەر کە لە جێگایەک دادەنیشن و پێکەوە دەژین

## ی

یاتاخگە: «ت»[1] جێگای ئارامش و خەو
یاگە: «هـ» جێگا
یاوا: «هـ» گەیشت
یاوەنەوە: «هـ» خوت بگەینە، بگەڕێوە
یەند: «هـ» تا رادەیەک
یوم الالست: «ع» کاتێ بێ دەستپێکردن، ڕۆژی دروست کردنی کەون و مەکان، ئەو ڕۆژەی خودا بە منالانی ئادەمی گوت: «الست بربکم» بۆچی من خودای ئێوە نیم.

---

١- ١- (ت) نیشانەیە بۆ وشەی تورکی.

## سەرچاوەکان:

١- تایجەوزی، عەبدولڕەحیم (مەولەوی)، دیوان، بە هەوڵ و تێکۆشان و لێکۆڵینەوە، گرد و کۆ و ئامادەکردنی مەلاعەبدولکەریمی مودەڕڕس، چاپی بەغدا.
٢- جوانرۆیی، مەلا ئەحمەد، بەرگە دەسنووسەکان (١٣٣٠ ک.م)
٣- جەلیلیان، روستەمی، بەرگە دەسنووسەکان
٤- حەسەنی، سەیید تاها، بەرگە دەسنووسەکان
٥- دەستگێردی، وەحید، خسرو و شیرین، نیزامی گەنجەوی، گرد و کۆ و ئامادەکردن، چاپی تاران.
٦- رۆستەمی خۆشمەکانی، موحەممەد بەگ، بەرگە دەسنووسەکان
٧- سەججادی، عەلائەددین، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی تاران.
٨- سیراجەددینی، شیخ موحەممەد، دەسنووسە بڵاوکراوەکان، رۆژمێری چیا، ساڵەکانی (٦١، ٦٢، ٦٣)
٩- سوڵتانی، موحەممەد تاهیربەگ، بەرگە دەسنووسەکان
١٠- سوڵتانی، موحەممەد عەلی، بەرگە دەسنووسەکان، دەفتەری ٣ و ٤
١١- سوڵتانی، موحەممەد عەلی، بەرگە دەسنووسەکان، نووسراوی ساڵی (١٢٠٥)
١٢- سوڵتانی، موحەممەد عەلی، بەرگە دەسنووسەکان، بە خەتی موحەممەد بەگی روستەمی.
١٣- سوڵتانی، موحەممەد عەلی، تعلیقات و مناجات‌های ادبی کردی، گرد و کۆ و ئامادەکردن، چاپی تاران.
١٤- سەیید زادە هاشمی، موحەممەد تاهێر، بەرگە دەسنووسەکان.
١٥- ساحیب، موحەممەد بەهائەددین، پیر شالیاری زەردەشتی، چاپی تاران.
١٦- شێخ ئەلئسلامی، ڕەشید، بەرگە دەسنووسەکان، نووسراوی ئەبولوفا، ساڵی ١٢٩٨.

١٧- عەمید، حەسەن، فرهنگ عمید، گرد و کۆ و ئامادەکردن، چاپی تاران.
١٨- کاردۆخی، موحەممەد ئەمین، دیوانی سەیدی هەورامی، چاپی بەغدا.
١٩- گولبون، موحەممەد، بهار و ادب پارسی، موحەممەد تەقی بەهار، گرد و کۆ و ئامادەکردن.
٢٠- قاجار، ناسرەددین شا، (منتخب السلطان) «خلاصە سعدی»، گرد و کۆ و ئامادەکردن، بە خەتی میرزا ڕەزای کەلهوڕ چاپی تاران.
٢١- موفتیزادە، سدیق، موهی بەدیعوزەمان، رۆژنامەی کوردستان ساڵی دووهەم لە ژمارەی ١ تا ١٠٣ چاپی تاران.
٢٢- موفتیزادە، سدیق، مُهی بەدیع و زمان، رۆژنامەی کوردستان ساڵی سێهەم لە ژمارەی ٤ تا ١٥٤.
٢٣- موکری، موحەممەد فرهنگ نامهای پرندگان در لهجەهای غرب ایران، گرد و کۆ و ئامادەکردن و نووسین.
٢٤- مەردۆخ، ئایەتوڵلا شێخ موحەممەد، کرد و کردستان و توابع «تاریخ مردوخ» چاپی تاران.
٢٥- موعین، موحەممەد، فرهنگ معین، گرد و کۆ و نووسین، چاپی تاران.
٢٦- مینورسکی، مقالات گوران و یاران.
٢٧- موعین، موحەممەد «برهان قاطع، موحەممەد حسەین بن خەلەفی تەبریزی»، گرد و کۆ و ئامادەکردن، چاپی تاران.
٢٨- هاشمی، سید باقر، بەرگە دەسنووسەکان.